من چیم سەگی بیلالم یا مووحەممەد
لە عیشقی تۆ هیلالم یا مووحەممەد
مەدحی تۆ مەگەر خودا بیکا هەر بۆ خۆی
نەک من کە زمان لاڵم یا مووحەممەد

# رسكان

(ديوانی شێعر)

عەبدولخالق پەرهیزی

**پرهیزی، عبدالخالق،۱۳۴۱_**

**رسکان** (دیوانی شێعر)/ عەبدولخالق پەرهیزی.

بۆکان: عبدالخالق پرهیزی، **۱۳۸۹**

**۳۵۰ ص** isbn: **۹۷۸-۹۶۴-۰۶-۹۲۲۷-۱**

**فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا (فهرستنویسی پیش از انتشار)**

**کردی – شعر سورانی - قرن ۱۴.**

**۱۳۸۹ ۳۶۳ پ۷۴۳س / PIR۳۲۵۶** **۸فا۹/۲۱**

**کتابخانەی ملّی ایران ۲۰۸۷۲۴۷**

**تاریخ ثبت: ۱۳۸۹/۵/۹**

رسکان

نووسەر: عەبدولخالق پەرهیزی

بڵاوکەرەوە: نووسەر

چاپی یەکەم: بۆکان **۱۳۸۹** ک.ه. (۲۰۱۰ ز)

گەڵاڵەی رووبەرگ: سۆراب رەشیدزادە

ئەژمار: **۳۰۰** دانە

شابک: **۱-۹۲۲۷-۰۶-۹٦٤-۹۷۸**

چاپ و بەرگ گرتن: چاپ اندیشە، بۆکان ۰٤۸۲-٦۲۲۱۸۱۰

# ناوەرۆک

## «پێشەکی»

شێعر گوزارشتە، گوزارشتی دەروونی شاعیر. راستە شێوەی دەربڕین و بەیان لە شێعرا خەیاڵاویە، راستە شێعر تێکڵاوە بە سۆز و کوڵ و هەست و هەڵچوون بەڵام ناوەرۆکی شێعر خەیاڵ و گومان نیە. ناوەرۆکی شێعر فکر و باوەڕە. شاعیرێک کە شێعری خۆی بڵاو ئەکاتەوە، یانی پەیغامێکی پێیە بۆ خوێنەر. یانی هەست و خوست فکر و بۆ چوون و مەنزوور و مەبەستێکی هەیە کە ئەیەوێ سەرنجی خوێنەری بۆ رابکێشی. یانی ئەیەوێ خۆشەویستی یان بێزاری، لایەنگری یان نەفرەت، شادی یان خەمی خۆی بەرانبەر بە دیاردەیێکی دەور و بەری خۆی لەگەڵ خوێنەر بەش بکا و خوێنەر لەگەڵ خۆی رێ بخا و خۆی لە چنگ تەنیایی رزگار کا. ئەگەر پەیغام نەبێ، ئەگەر مەبەستی شاعیر و نووسەر هەر کایە کردن بە واژە بێ، ئەگەر شاعیر لە مەبەستەکەی خۆی نەگا کە چی ووتوە، پێویستی چیە کە شێعرەکەی چاپ و بڵاو بکاتەوە؟ با هەر بۆ خۆی بە تاقی تەنیا کایەی پێوە بکا و پێوەی سەرگەرم بێ و تەواو.

ئا لێرەدایە کە بەرپرسی و دەروەسی شاعیر دێتە ناو. شاعیرێک کە شێعرێک ئەڵێ و چاپ و بڵاوی ئەکاتەوە و بەو

شێعره خۆشەویستی یان نەفرەتی خەڵکی بەرانبەر بە دیاردەیێک ئەهارووژێنێ یان هزر* و باوەڕ و بۆ چوونێک لە خەڵک ئەگەیێنێ، ئەبێ بزانێ داخوا ئەو خۆشەویستیە یان ئەو نەفرەتە ڕەوایە یان ناڕەوا؟ ئەو هزر و باوەڕ و بۆچوونە ڕاستە یان هەڵە؟ خۆی لە سەری سووره یان ئەمڕۆکە ئەیڵێ و سبەینێ لی پەشیمان ئەبێتەوه؟ بە تێ فکرین و قووڵ بوونەوه و ڕەنج دان پی گەیوه یان هەر هەوەسێکە و ئان و ساتێک بە سەریدا هاتووه؟ خۆی بەش بە حاڵی خۆی ئامادەیە هەتا سەر داکۆکی* لەو هزر و باوەڕە بکا و ڕەنجی لە پێناوا بکێشێ و خەرج و تاوانەکەی* بە ئەستۆ بگرێ یان نا؟ قەت بەو هزر و باوەڕەوه ژیاوه هەتاکوو کەم و کووڕی و ناتەواویەکانی بە چاو ببینێ یان نا؟ قەت بە کردەوه لە سەر ئەو هزر و باوەڕە بە جواب هاتووه و داکۆکی لێ کردووه یان نا؟

ئێسا وای دابنێین کە شاعیر و نووسەر پەیغامێکی پێ بوو بۆ خوێنەر و بەرپرس و دەروەسیش بوو و خەرج و تاوانی ووتەکانی خۆیشی بە ئەستۆ گرت بەڵام کار بەونە کۆتایی نایێ. شاعیر مرۆوه. مرۆو هەمیشە لە حاڵی ئاڵ و گۆڕایە و ئەزقەزا هەرچی بەرپرسی و دەروەسیەکەی زیاتر بێ، هەرچی تێ فکرین و قووڵ بوونەوەی پتر بێ، هەرچی بۆ ئەوەی لە جیهان بگا و مانای ژیان بزانێ زیاتر ڕەنج

بکێشێ، ئاڵ و گۆڕی زووتر و زیاتر بە سەرا دێ. وای دابنێین شاعیرێک لە تەمەنی بیستساڵانەوە دەس ئەکا بە شێعر ووتن و حەفتا ساڵیش ئەژی، تۆ بڵێی ئەو مرۆوە لە تەمەنی حەفتا ساڵانا هەر ئەو مرۆوەی تەمەنی بیست ساڵانەکە بێ؟ دیارە وا نیە. لە بەر ئەمەیە کە خوێنەری شێعر ئەبێ هۆشیار بێ. ئەبێ بزانێ کە شێعر شێعرە و وەحیی ئاسمانی نیە. ئەبێ بزانێ کە شێعر هەر گوزارشتە و بەس، گوزارشتی دەروونی شاعیر. گوزارشتی دەروونی مرۆوێکە ـجا چاک بێ یان خراپـ لە هەل و مەرجێکی تایبەتا و لە قۆناغێکی دیاری ژیانیا. ئەبێ بەم چاوە شێعر هەڵ بسەنگێنێ و بزانێ ئاخۆ شتێکی بەکەڵکی لێ هەڵ ئەکرێ* یان نا.

ئەمەیە کە خوداوەند تەعالا ئەفرمێ: «وَ الشّعَراءُ یَتّبِعُهُمُ الغاوُونَ* اَ لَم تَرَ اَنّهُم فی کُلّ وادٍ یَهیمون* وَ اَنّهُم یَقولونَ ما لایَفعَلون*»[1] واتە: «شاعیران تەنیا گومڕایان دوایان ئەکەوون. نەتدیون کە لە هەموو دۆڵ و دەرە و بێرێییێکا سەر پێوە ئەنێن؟ وە بە راستی ئەوان شتێک ئەڵێن کە خۆیان نایکەن.»

دەردی شێعر و ئەدەب ئەم دوو دەردەیە. یەکەم ئەوەی کە شاعیر و نووسەر چاوی ئەقووچێنێ و دەمی بەرەڵڵا ئەکا؛ هەرچی بە دەمیدا هات نایگێڕێتەوە و کاری بەوە نیە کە

ئەوەی ئەیڵێ بـەری بـە کوێوەیـە و سـەر لـە چ سـنوور و کەوشەنێک* ئەدا و چ نانێک ئەنێتـە کۆشـی خوێنەرەکـەی. دووهەم ئەوەی کە لە نووسینا کەسێکە و لە کردەوە و ژیـانی رۆژانەدا کەسێکیتر. شتێک بە خەڵک ئەڵێ کـە خـۆی قـەتی باوەڕ پی نەبووە و قەتی نەکردووە و قەتیشـی ناکـا. چـەنێ زۆرن ئـــەو شـــاعیر و نووســـەرانەی کـــە لـــە شـــێعر و نووسراوەکانیانا هەزار فڕ و فیشاڵ ئەکەن کـەچی خۆشـیان لـە کـردەوەدا پـەیرەوی لـە یـەکیان ناکـەن. لـە شـێعر و نووسراوەدا ئازادیخوازن، شۆڕشگێڕن، خۆ بـەخت ئەکـەن، خوێنی خۆیان ئەڕێژن لـە پێنـاو مرۆوایـەتیدا، لـە پێنـاو عەداڵەت و یەکسانیدا، لە پێنـاو راسـتی و حەقیقـەتا، لـە پێناو سەداقەت و پاکیدا، کەچی لە کردەوەدا مرۆوایەتی بـە تمەنێک ئەفرۆشن. سەروەت و سامان و ناو و شۆرەت و پلـە و پایەی دنیایی بە جێی خۆی کە چی نامێنـێ بـۆی نەکـەن، زۆر ناڵـێم، هـەر بـۆ ئـەوەی دوو دێـڕ نووسـراوەیان لـە گۆوارێکا چاپ بێ یـان لـە کۆڕێکـا بخوێندرێتـەوە و پیـان بووترێ شاعیر و نووسەر، حازرن خـوێنی سـەد کـەس لـە پیاڵە کەن. بۆ خوێنی سەری کەسێک ئەگـەڕێن کـە ئـەتوانێ دێڕێک لەوان جوانتر بنووسێ. زاڵمن، دڵـڕەق و بێـڕەحمن، دزن، درۆزنـن، ریابـازن، فێڵـاوی و پیلانگێـڕ و فیتنـەن، خوێڕی و چـرووک و خۆفرۆشـن، خـۆ بـە زل زان و لـووت

بەرزن، بەغیل و بەرچاو تەنگن، بێوەفا و بێئەمـەگن... بـە کورتی، هەر گەورەیی و کەرامـەت و فەزیلـەت و ئـەخلاق و ئینسانەتییێک کە لە شێعر و نووسراوەکانیانا پیا هەڵ ئەڵێن و بانگــەوازی بــۆ ئەکــەن، بــۆی بگــەڕێ، دەقــاودەق پێچەوانەکەی لە ووجوودی خۆیانا ئەدۆزیەوە. ناڵێم هەموو شاعیر و نووسەرێک وان. ناڵێم شێعر سـەرپاکی گومڕاییـە، سەرپاکی بێکەڵکە. پێغەمبەری خودا (درووودی خودا لـە سـەر خۆی و بنەماڵەی پاکی) ئەفەرمێ: «اِنَّ مِنَ الشِّـعرِ لحِکمَة وَ اِنَّ مِنَ ا لکَلامِ لَسِحرٌ»، واتە: «بە راستی شێعری وا هەیە حیکمەت و زانایيە و ووتە و کەلامی وا هەیە کە سێحرە.» راسـتیەکەی ئەوەیە کە گوزارشتی دەروونی هەموو مرۆوێـک، ئەگـەر لـە رووی راستیەوە هاتبێتە دەربڕێن و ئەگەر ئەو مـرۆوە تـەنیا شتێک بلێ کە خۆی ئـەیکا، بـە کەڵـکە. کـە ئەڵـێم دەروون مەبەستم هەر ئـەو شـتە نیـە کـە بـە تایبـەت مـەوزووعی باسەکانی دەروونناسیە، مەبەستم هەموو بـوونی دەروونـی مرۆوە، رۆحی مرۆو بە هـەموو لایەنەکانیـەوە کـە ژیـان و جیهانی دەرەوە رەنگی تیا ئەداتەوە. ئەگەر ئێمە ئاگامان لـە دەروونی مرۆوێکیتر ببێ و بزانین چۆن فکر ئەکاتەوە و چۆن هەست ئەکا و جیهانی لە بەر چاو چۆنە و مانـای ژیـان بـە چی ئەزانێ، ئائوە زۆر بە کەڵکە، زۆرمان یارمەتی ئـەدا کـە

ووردتر و قووڵتر لە جیهانی دەور و بەری خۆمان بڕوانین و ئەم جیهانە بناسین و سەر لە ژیانی خۆمان دەر کەین. شێعر یارمەتیمان ئەدا کە خۆشەویستی و نەفرەت و باوەڕ و بۆچوونی خۆمان لە بارەی دیاردەکانی جیهانی دەور و بەرمانەوە جوانتر و ڕەوانتر دەرببڕین و چاکتر لە خۆمان بگەین و خۆمان لە خەڵک بگەیێنین. شێعر یارمەتیمان ئەدا کە لەگەڵ مرۆویتر بە هاودڵی و هاوبڕوایی بگەین و لە هزر و باوەڕ و خەم و شادی و ئەزموونەکانیانا بەشدار بین. شێعر یارمەتیمان ئەدا کە ژیانمان خەنیتر و ڕەنگینتر بێ.

لێرەدا دێمە سەر ئەو مەبەستەی کە ئەمەوێ باسی بکەم: شێعر بۆ من خەیاڵ و گومان نیە، هەوا و هەوەسی ئان و ساتی نیە، کایە کردن بە واژە و قسەی بێ سەر و بن نیە. گوزارشتە، گوزارشتی دەروونی خۆم، گوزارشتی هزر و باوەڕ و هەست و خوست و بۆچوونی خۆم، گوزارشتی خۆشەویستی یان بێزاری خۆم بەرانبەر بە دیاردەکانی جیهانی دەور و بەرم. گوزارشتی ئەو شتانەیە کە پیانەوە ئەژیم و ئەیان کەم. گوزارشتی ئەزموونی ژیانی خۆمە، گوزارشتی کردەوە و ڕەوشت و ڕەفتاری خۆمە. شێعر بۆ من سەیر و سلووکە.

ڕەنگە ئەم چەند پارچە شێعرە بۆ کەسێکی وەک من کە هەر لە سەرەتای لاویمەوە ژیانی خۆم تەرخان کردووە* بۆ

شێعر و ئەدەب، هێندێکی کەم و قــەبارەییێکی* بچــووک بــێ. بەڵام من وەک ئــەو شــاعیر و نووســەرانە نــیم کــە هــەموو کارێک ئەکەن _ تەنانەت بــەنگ و حەشــیش ئــەخۆن _ بــۆ ئەوەی دێڕێک زیاتر بنووسن. ئەگەر وەک هێندێ کەس هــەر چی بە دەمما ئەهات بمووتایە، سەد هێندەی ئــەمم ئــەووت. کەمم ووتوە و لەوەشی کە ووتوومە زۆر کەمتری رێگای چاپ و بڵــاو بوونــەوەم پــێ داوە. لام وایــە ئــەم چەنــد پارچــە هەڵبژاردەیە بەسە بۆ ئەوەی کە خوێنــەر بزانــێ کــێم و لــە کوێوە هاتووم و بە کوێ گەیشــتووم. بــا خوێنــەر ســەرنجی بڕواری داوێنی شێعرەکان بدا و پلە بە پلە بــە پــای زەمــان و کات لەگەڵم بێتە پێشــەوە تــا دوایــین شــێعر. ئەمــە چەنــد قۆناغە لە ژیانی مرۆوێک. ئەزموونێکە لــە ژینــی بەشــەری. دوور نیە خوێنەر لە ژیــانی خۆیــا کەڵــکی لــێ وەربگــرێ و ئاسۆی روانینی پی فرەوانتر و رووناکتر بێ و وای لێ بکا کە قووڵتر و ووردتــر فکــر بکاتــەوە و لــەم ئەزموونانــەی منــا بەشدار بێ و کەمتر خۆی بە تەنیا بزانێ.

با ئەمەش بڵێم: من کە هەر لە سەرەتای لاویەوە ژینی خۆم بە تەواوی تەرخان کردبوو* بــۆ شــێعر و ئــەدەب، لــە ساڵی ١٣٧٧ دا، لە تەمــەنی ٣٦ ساڵــانا، دوای رەنجــی بــێ-ئامانی چەند ساڵە تازە پێگــەیبووم و گەیشــتبوومە دونــدی توانای داهێنەری هونەری خۆم و کاتی ئەوەم بوو کە بنووسم

که کارەسات تێکیەوە پێچام و ژیانم سەر و بن بوو. لە سەر ئیشی مامۆستایی زانستگە* هەڵدێرام و کەوتمە دەربەدەری و هەڵوەدایی* و عەودالی*. هاوکات لەگەڵ ئەم قەیرانە* ئاڵ و گۆڕێکی فکری سەختم بە سەرا هات کە بناغەی هزرەکان و باوەڕەکانمی گۆڕی؛ ئایاتی ڕەببانی دەسی گرتم و لە ئەنجاما دەسم لە دوودڵی هەڵگرت و بە کردەوە پام نا ناو ڕێگەی سەیر و سلووکی عیرفانی و ژیانی دەروێشیم هەڵبژارد. ئەوە بوو کە ئەو فەرهەنگەی کە پێشتر داهێنەری هونەری خۆمم لە سەر بنیاد نابوو، ڕووخا و هەڵوەشاوە. بەم جۆرە چوومەوە نووک و لە سیفرەوە دەسم پێ کردەوە کە وورده وورده خۆم ڕا بێنم بۆ ئەوەی کە لەسەر بناغەی* ئەم جیهان بینیە تازە دەس بدەمەوە داهێنەری هونەری. بەرهەمە پێشوەکانیشم بەم نیگا تازە خستە ژێر زەڕڕەبین. زۆر شێعری لە باری هونەریەوە بەرز و بە نرخم لێ فڕێ دان لە بەر ئەوەی لێرە و لەوێ بەندێ یان وێنە خەیاڵێ یان ووتەیێکی وایان تیا هاتبوو کە لەگەڵ باوەڕی ئەمڕۆکەم نەئەهاتەوە. هێندێکیشیانم بژار کرد. ئەونەی لێ ماوەتەوە کە ئەیبینن. با بە پا داگرتنیشەوە بڵێم، هەرچی لە دووتۆی ئەم دیوانەدا نەهاتبێ، مەگەر بە دەسی خۆم بڵاوی کەمەوە یان لەمەو دوا بیڵێم، ئەگینا هی من نیە و کەس بۆی نیە بۆی بگەڕێ و لە سەری بڕوا.

لە کاتی دەربەدەریشما قوڵە ڕێکخراوەییێکی چەتەی بە ناو کوردی ئێرانی رووتی کردم و وێڕای چاویلکەکەی چاوم و ئاڵقەکەی قامکم و هەرچی لە گیرفانما بوو، چەن پارچە شێعر و کۆمەڵێک یادداشتی لێ داگیر کردم کە بۆیان بەداخەوەم. ئەو شێعرانە کە هێندێکیان شێعری دڵداری بوون جێگایان لەم دیوانەدا خاڵیە.

خاڵێکی‌تر هەیە کە ڕەنگە سەرنجی خوێنەر ڕاکیشێ و بۆی ببێتە پرسیار، ئەویش ئەمەیە کە دوو کۆمەڵەی «فریشتەی کۆلیل» و «مەرگی سۆراب» بە شێوە زمانی موکریان ووتراون بەڵام باقی شێعرەکانی ئەم دیوانە بە شێوە زمانی سۆرانین. ئەڵبەت هێندێ تایبەتمەندی بن زاراوەی موکریم لەگەڵ سۆرانیەکە لێک داوە. ڕاستیەکەی من کە لە سەرەتای چالاکی نووسینمەوە کەوتمە دوای ئەو ڕچەی کە مامۆستا هێمنی ڕەحمەتی لە بەر کۆمەڵی ئەدەبی کوردی نا و هەرچی نووسیم بە بن زاراوەی موکری نووسیم، پاشتر دوای لێ کۆڵینەوە و فکر کردنەوەییێکی زۆر هاتمە سەر ئەم باوەڕە کە زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی (زاراوەی کرمانجی ناوەڕاست یان سۆرانی) کە لە سەرەتاوە لە سەر بناغەی* بن زاراوەی بابان، یانی زمانی نالی و سالم و کوردی، زمانی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی (قُدّس سرّەالشّریف) ڕچەشکێن و بناغە دانەری شێعر و ئەدەبی

**سۆرانی، دامەزراوە، چاکتر وایە کە هەر لە سـەر ئـەو رچـە بڕوا. ئەوە بوو کە لە پاش ئەو دوو کۆمەڵـە هاتمـەوە سـەر ئەم شێوە زمانە.**

**١٣٨٨/١٢/٢٥**

**رەبەت**

---

[١] سوورەی پیرۆزی «شعرا»، ئایەتەکانی **٢٢٤** تا **٢٢٦**

*بە یادی پیرەمێرد*
*پێشکەشە بە منداڵانی لادێ*

## «شاری ئاوات»

هەواڵان! هەواڵان!     کیژان! کوڕان! مناڵان
وەرن با خانوو بکەین     با خۆمان مانوو بکەین
لە جێیێکی نەرمانی     لە دەوری ئاو و کانی
ماڵ دروست کەین پێکەوە     بە باخ بڕازێتەوە
دڵگیر و خۆش و رووناک     وەک کوێستانان سەوز و پاک
بە گەل کار بکەین ئەمجار     هیچ کارێک نیە دژوار
تەراکتۆر بخەینە کار     سەرەو ژوور و سەرەو خوار
دەوری ماڵان بکێڵین     بووره* و بەیار* نەهێڵین
داچێنین دانەوێڵە*     کاری راست و بێفێڵە
گەنم و جۆ سپی و پەڕشە     گەنمە شامی و جۆ ڕەشە
نیسک و نۆک لەگەڵ پاقلە     ماش و کونجی و سیاوڵە
تەڕەکاری* سەد رەنگە     بامیە و بیبار و پونگە
جەعفەری و شویت وکەوەر     دەیان دوورین بەر بە بەر
ریحانە و تەڕەتیزە     خواردنیان تا پاییزە
باینجان و تەماتە     خۆراکی کات و ساتە
توور و تربچە و گێزەر     سێوک* و پیاز و چەوەندەر
قاخڵی* و گوڵە بەڕۆژە     شێوەیان وەکوو رۆژە

بێستان لامالە و کەردوو　　قەد قەد کوولەکە و کەدوو
خرچە و ترۆزی و خەیار　　کاڵەک و شووتی و کالیار
گرکە دێمی خۆرەتاو　　بۆنی پڕ بکا دەراو
باخێ پڕ لە میوە بێ　　هیچکەس باخی وای نەبێ
گێلاس لەگەڵ بڵاڵووک*　　هەڵووچەی گەورە و بچووک
ئاڵوو زەرد و سوور ئاڵوو　　قەیسی و قۆخ و سێو و توو
هەرمێ و هەنجیر و بەهێ　　گوێژ و بادام و ترێ
دارنارنجی چراخان　　سنجوو لە دەوری باخان



هەواڵان! هەواڵان!　　کیژان! کوڕان! مناڵان!
وەرن پەیمان دەبەستین　　لە سەر پەیمان دەوەستین
هەموو وەک یەک کار دەکەین　　مفتەخۆران تار دەکەین
ئاغا و سەرکارمان ناوێ　　گەورەی لاسار*مان ناوێ
کێ زانا و بلیمەتە*　　کێ ئازا و بە هەڵمەتە
پارێزگارە و لە خواترس　　لە کاراندا دەکا پرس
ئەوە دەکەین بە رێبەر　　جا پشتی دەگرین یەکسەر
هەموو دە ـ رس دەخوێنین　　با بۆ هیچ دانەمێنین
یەکمان دەبین بە دوکتۆر　　دەرد ناهێڵین کەم و زۆر
یەک دەبێ بە ئەندازیار*　　دێنێ کەرەستەی تەیار*
دروست دەکا رێگا و بان　　شەقام و شارێ و مەیدان
کۆشک و تەلار ساز دەکا　　بۆ تیاتر و سینەما
گۆڕەپانی بەئەرزش　　بۆ کایە و گەمە و وەرزش

خانووی سەد قاتی بەردین
پـەیـکەرتـاشی پڕهـونەر
حەوز و کفارەی* لێ دەنێ
کـاک ئـەندازیاری مێعمار
سـەیرانـگە و باغی گشتی
باخـچە بـۆ کایـەی منداڵ
فێرگە و راهێنگەی زەوەند*
زانستگە و کـۆڕی تـۆژەر*
هـەمـوو جـۆرە کارخـانە
مـەکـینەی* وورد و گەورە
گـوڕە گـوڕ و تـەقە تـەق
قـەتـاری تـیژڕەو وەک با
هـەر بـخـشێ و بهووژێنێ
ئـەوسـا تـەلـی کـارەبـا
بـە گوڵـۆپ و چرای بلوور
وەکـوو سێحر و مووجیزات
دەسـت بـەری بۆ دوگمەیێ
وەکـوو شانەی مێش هەنگوین
بـۆمـەیـدان دەکـا پـەیـکەر
بـە سـەد جـۆر ئـاو بنـوێنێ
ئـەمـجار سـاز دەکا بۆ شـار
لـە هـەر چـووار تـەنـیشتی
جـێـی سرەوتی کـۆنـەساڵ
کـتـێـبـخـانەی دەوڵـەمەند
مـووزەی ئـەنـتیکە* و هونەر
عـەمـباری سـاز، بـارخـانە
هـەڵـبـسـووڕێـن بـە دەورە
نـەڕە نـەڕ و شـەقـە شـەق
لـە بـن هـەرد* و لـە هـەوا
مـسـافـیـر دانـەمـێـنـێ
دەکـێـشـیـن بـۆ هـەمـوو لا
ووڵات دەکـەین نـوقمی نوور
وەک جـادووی نـێو حیکایات
هـەرچی پـێت خـۆش بێ ببێ



هـەوالان! هـەوالان!
کـە شـارمـان رازانـدەوە
نـێـوی دەنێین کوردستان
زلهـێزی* ئـیستیعمارگەر
کـیژان! کـوڕان! مـنـالان!
نـێـوی بـۆ بـدۆزنـەوە
دلـێـرسـتـان، مـەردسـتان
هـێرشـمان بـێـنـێـتە سـەر

تــەمــاح بـکاتــە مــاڵمان — بــە فــێــڵ تــێک بــدا حاڵمان
یــان بــە کــەمــمان بــزانێ — خـــراپ تــێــمــان بــڕوانـــێ
کــەلــلــەی بۆ تیمار دەکەین — ئــەم دنــیای لــێ تار دەکەین
بــە گــو لــلــە دەیــتەزێــنین — لـــە جــەنــگا دەیــبەزێــنــیــن



هـــــەواڵان! هـــــەواڵان! — کـــیژان! کـــوڕان! مــنــاڵان!
ئەمانە و سەد هێندەی دی — هــەر بــە خــوێــندن دێــتە دی
خــوێندن دەوای دەردمانە — ســەنــگــەری نــەبــەردمــانە
خــوێندن داری دەسمانە* — هــەر بــە تــەنــیا بــەســمانە
هــەر مــیللــەتێ بــخوێنێ — هــەرگــیز شــکەســت ناهێنێ
تــەنانــەت بومبای ئەتوم — زانــا نــاکــا ســەرنـــەگـــوم
کــام داگــیرکــەر کە پتەوە — بـــە زانــســت دەتــوێــتــەوە
هــەر بــژی خــوێندەواری — مـــرۆی خـــاوەن زانــیــاری

١٣٦٨
تاران

## «لێبڕان»

**دیسان زستان دوایی پێ هات،**
**هەتاوی هیوام گە ـ رم بوو،**
**وەک دەنکە تووی نێو چاڵی تەڕ**
**لە گۆڕی دەرد و حەسرەتدا**
**چەکەرەم کرد؛**
**وەختیەتی کە بڕوێمەوە!**

**خاکەلێوەی ١٣٧٠**
**تاران**

*بۆ کۆچە خوێناویەکەی کوردستانی ئێراق*

**«کۆچ»**

**با دێ، با دێ، ڕەشەبایە!**
**خێوی* زەوی شێتی ڕقە،**
**ئاخۆ دیسان لە چ شوێنێ**
**گوڵنمێک باران باریوە،**
**لاوێچێک ئاو**
**بە قرچە قرچی نێو جەرگی**
**کامە بێروون*دا ڕۆچووە،**
**هەرێمی ئاگربارانی کام دێوزمە**
**بە شنەی فێنکایی هەژیوە*.**

**با دێ، با دێ،ڕەشەبایە!**
**خێوی زەوی وەک هاری دڕ دەبڵمێنێ*،**
**دیارە دیسان**
**نزای لەم مەڵبەندە کردووە؛**
**بڕوانن ها...**
**خێوی هەموو دیرەگە* ڕەشەکان**
**سەیرمان دەکەن!**

مەحتەل مەبن،
بەرگی چی و پەنا دەڵێ چی،
دار و بەردیش دادەتولێنێ*...
ئاخۆ لە کوێ
لاوێچێک خوێن
خۆی بە کوورەی جەهەندمی
لانی دێوێکدا کردووە،
وا گشت زەوی راتەکاندووە.
دەغیلتان بم،
ئازای ئەندامم هەڵوەری!
روو لە کوێ کەین؟...
لە درگای ئەم سنوورە دە،
گەرچی سوور سوور
ئەهریمەنی لە پشتدایە...[1]

پێ لە تەرمان بپارێزن،
هێشتا زۆریان دەتانناسن،
نەک بە بزە بتاندوێنن،
بڵێن: «بڕۆن با ئێوە بمێنن!»
دەنا چۆکتان دەچێتە بەست.*

روو لە کویێ کەین؟...
بەری پێم تواتوایە!
ئاخ رۆڵە،
هەر تەنیا دەمە کەوچکێکم
لەو سەدەقە بۆ وەر بگرە
بشکوو نێوسکم گەرم کا،
گەرچی دەزانم ئەو سوورفلە*
دەستی لەگەڵ خێوی بایە.
رۆژ هەڵنەهات؛
دیارە ئەهریمەن لە کارە و
ئاسۆ لە دەستی ئەودایە...

با دێ، با دێ، رەشەبایە!
ئیتر پێم لە شوێنم نایە...
رۆڵە کوێر بم
وا گۆنا ناسکەکانی تۆ
شین هەڵگەڕان.
لفکەی دەسماڵەکەت تەڕ کە
ـ بە فرمێسک
با بە ژەهری دوژمن نەمرم ـ
لە سەر لێوەکانمی دانێ،

کڵپەی* دڵم وەکوو نێڵەی* تەنوور وایە...
لە من گەڕێن، بەشکوو دەرچن!
روو لەو بەرە،
گەرچی دەزانم
سەد پیلانی لە نێودایە...
رووسوورەکەم! دڵبەرین* بە،
تەرمی برا خونچیلەکەت
لە باووشتا هەڵمەهێنە؛
فریشتە خەفەتبارەکان
چاویان لە بەر
ئەم دیمەنانە هەڵنایە...
نزا لەم خاکە کراوە؛
بڕوانن ها...
گەورەی دێوان ـ رەش و سوور و نزیک و دوور ـ
سەریان لە بن گوێی یەکدایە،
لە سەر ساباتی دووکەڵ ڕا
مشقە مشقیان* بە ئێمە دێ.
دەغیلتان بم
بەشکوو ئێوە...
ئێــ... وە...

**ئێــ**...

**۱۳۷۰/۱/۱٤**

**تـاران**

---

[۱] ئاماژەیە بۆ سنووری ئەو وولاٚتانەی کە لە جیاتی پەنا دان بە پەنابەرە بێدەرەتانەکان، دەستیان کرد بە کوشت و بڕیان.

## «هەڵفڕینە گەشت»

زەردەی خۆر هات*.
هەڵیکردە شنەیێکی نەرم.
زەوی وەکوو
مندالێکی تێر و پڕی بزۆزی* شۆخ*
لە خەو هەستا.
شار لە گوێنی* گۆزە هەنگێک
گڤەی* سڕی بەرە بەرە تیژتر دەبوو.
دیوارەکانی حەوشەکەم
شان و ملیان رەقاندمەوە*،
پشووم سوار بوو.
لە خشتی عەبووس دەرباز بووم.
باڵی ماندوویی و تینوەتیم
وەک دەستی بێ هەڵپە* و ترسی مەلەوانێک
خستە سەر شەپۆلی زەردی تاو،
ئارام، شەیدا، دڵفەرێح*، خاو.

دەشت لە دوای دەشت، بەرین*، رووناک،

تێکڵاوی بەحری بێبنی ئاسمانی پاک.
کەروێشکەی* مەخمەرێکی سەوز
شەپۆل شەپۆل
لە نێو شینێکی ئاوداردا دەتوێتەوە.
پڕشنگی زەرد تا بێسنوور
دەگەڕێتەوە.
دڵم وەکوو سێی* باڵدارێک
لە دەشت و هەوراز هەڵپێکا*؛
لە دەلاقەی ئەوینەوە
سەرنجم دا، سەرنجم دا:

بەرخۆڵەییێکیان گەستبوو[١]،
وەک دڕندە
لە بندەستی خۆی دەپچڕی.

جوانەمەرگێک
لە گۆڕەکەی شین ببوەوە،
گاشە بەرد*ی توند توند لە باووشی دەگرت
چەشنی یاری ساڵان نەدیو.
بە خاکی ووشکدا دەنووسا*،

دەتکوت ئاوی زولاڵی لێ دەخواتەوە.
ببوو بە گێژەڵووکە شێتێک
هەمووی زەوی بە سەمای مەستانە دگەڕا.

پاڵەوانێک
هات لە دایک بێ،
ناسیانەوە؛
رەگی نێوکیان هەڵپەرتاوت*.
بە دەوری خۆیدا لوولی خوارد،
بە پاشماوەی خوێنی دڵی ژیوار بکا*؛
سەنگ و بەردی منداڵدانی دایکیان نا.
سەری لە بەر خۆی دەرهێنا،
بە پاشماوەی شەوقی مێشکی قنیات بکا*؛
زلگۆییێکیان*
لە نێو دڵی دایکی چەقاند،
گۆپاڵ بە دەست
ئەم شانەو شانی راوێستان،
زەلامێکیان لە پشت دانا.

لە مەڵبەندێک*

سەرانسەر گرمەی دەهۆڵ بوو،
زیڕەی زوڕنا،
گەڕی* هەڵپەڕکێ گە ـ رم بوو،
سێ بازەکی دەیان کوتا*،
شادیانە بوو،
منداڵێک هاتبووە دنیا.
بەندبێژ بەستەیان ڕێک دەخست،
سەربەندیان بۆ وەردەگێڕا:
«ئۆخەی مەترسی بە سەر چوو،
ئەوەی ئەمجارەش لە دایک بوو،
خێچە، خوارە،
وەک ئێمە پڕ عەیب و عارە.
سپاس بۆ خودا
کە ئەمجارەش نەشکاینەوە،
لە سەر تەختی شانازی خۆمان ماینەوە!»

شار بە دەرێکی* دەروون کەیل*
پاڵی دابوو بە تەنیشتی کێوێکەوە،
بازەڵێنی بە قاشووی* مانگ و ڕۆژ دەکرد.

کارمامزێک دایک جێی هێشتبوو،
لانی گورگی لە بەر چاو ببووە مێرغوزار*،
پڵنگی زەردی نێو نابوو
مامزی خاڵدار...

گەلێک مەڵبەند،
گەلێک روانگە*...
پێڵی چاوم گیرایە خوێ.
چێشتەنگاوە*،
تەنووری ماڵان دە ـ گرێ.
کۆڵەکەی دووکەڵێکی رەش
ئاوایی و ئاوایی، دێ بە دێ،
سینگی گەرمی ئاسمان دەبڕێ.
هەنیەم* شەڵاڵی* ئارەقە.
خۆم لوول دەکەم
بەرەو نشێو*،
بەشکوو دڵ و لەش و سەرم
لە سێبەری بەر دیواری حەوشەکەمدا
ئارام بگرێ.

١٣٧٠/٨/٢
بۆکان

---

١ گەستن لێرەدا مانایێکی تایبەتی هەیە، واتە: گەستنی چوارپێی هار کە شتێکی تر دەگەزێ. یەکەم نیشانەی ئاژەڵی هاریش ئەوەیە کە بن دەستی خۆی دەخوا.

## «بنی رێگا»

ناهومێدی
دووکەڵێکە لە کڵی* کوێرەبووی*
بن تەنوورێک بە کەوان هەڵدەستێ.
دەرک و بان دادە ـ گرێ بێئامان.
رۆ ـ شنایی گومە.
تەقەلا و حەول لە هەناسە دە ـ برێ.

من گەلێ بێشەم* شەق کردووە
چڕ* و تار* بێملەما*.
پەل بزێویم لە زەلا کردووە ئاسۆی نە ـ دیار.
باووشم کردووە بە کۆڵەکە تیشکا بەرەو ئەسمان.
کوێستانم بە گەلی گورگیەوە پێواوە* بە تەنیا
کە هەتاو نەیدیوە.
من گیانی
ئا ـ گر و ئاو و هەڵۆم ناسیوە.

ململانێی* کاتم کردووە تا هەناسەی چنراوە.
بنەبڕ* بووم و وەریوم بە سەدان جار، وەک بی
لە پەلی ووشکە لقی خۆمەوە ریشەم داوە.
بە شەڵاوی* نێنووکی شە ـ وق
کەوەڕووبەندی* سەوادی* شەبەقم* لاداوە.
من بریسکەی دە ـ نکی ئیشقم*
لە دڵی شەمشەمە کوێرەییێکدا دۆزیوەتەوە.
بەر لە هەستانی مەلائیک
زوقمی سەر گۆنای مانگم
بە لەپی دەستم ماڵیوەتەوە.

بە مدەی* عومرم ئەمن
بەرەو ئەم دوندە دەهاتم.
چەندەها خولیای شەوق، چەند حاڵی شێت.
چەندەها گێژەنی* ئێش، چوک و رەوەز.
چەندەها زەردی* ترس، کۆڵی ئومێد.

شوێنە پێی ئەم رچەیەم تاڵ تاڵ شی کردووەتەوە.
دیمەنی یەک بە یەکی کوچک* و گ ـ یای
هەر وەکوو بیرەوەری ژوانی هەوەڵ

لە دڵی خۆم دا جێم کردووەتەوە.

کۆڵە بارێکە د ـ یاریم
لە خەوانی بەشەوارە*،
لە سریشکانی* توندی قەتیس*،
لەو نهێنیانە کە پەنگاوە* لە رەگ،
لە هەڵاوی* نە ـ دیاری ناخ*،
لە پەچەی* دزروای شاژنی* شار،
لە قوتەی* سەر لەمپەری* باخ،
لە گەڵاڵەی* خولقانی مە،
لە قومی سەرچاوە جریوە،
لە بەسەرهاتی ئەزەل،
لە دەقی* کاری ئەبەد.

من دەهاتم بگەمە ئەو بەری ژان.
من دەهاتم بگەمە بانی جیهان.
کەفچڕێنە* چۆماوی ڕەگم.
بەرزە روانگەی نەزەرم.
نیە باکێکم لە چەوسان*.
چ بترسم لە کەن و کۆسپ!*

من دەکارم* رابکەم تا بنی هەرد*.
دەتووانم بفڕم تا بەری رۆژ.
ئەی مخابن*، ئەی ئەفسووس،
نەمدەزانی سەری دوند
تووشی گولییێکە* چەتوون*!

رۆژ درەنگە و تاریکی
رۆدەنیشێ لە وولات
وەک خەونێکی زاڵ،
وەک زەردی خەزان،
وەک مقەددەر بێچرکە، نەچار.



ناهومێدی
دووکەڵێکە لە کڵی کوێرەوە بووی
بن تەنوورێک بە کەوان هەڵدەستێ.
بێئەمان ماڵ دە ـ خنێ.
نیە پەیژێ کە سەرم خا بۆ بان.

## چ جریوەم نایەتە گوێ.[١]

١٣٧٠/٩/١٣
**بۆکان**

١ ئەم شێعرە لە هاوینی ساڵی **١٣٧١** دا لە کەناری کۆنگرەی مەولەوی کورد دا لە سەقز، هەر وەها لە شەوی شێعرێک دا لە زانستگەی ئەمیر کەبیری تاران خوێندراوەتەوە.

## «فریشتە کۆلیل»*

لە سەیری گوڵشەنی* عەڕشا،
لە تافی* شادی بێخەوشا*،
لە کۆڕی مەستی مەیدا بوو؛
لە دۆزەخگای زەوی روانی:
گژە گژ*، خۆڵەپۆتێ*، گەردەلوولی* خاک،
تەم و دووی* ئاهی سینە، ناڵە ناڵی بێووچان؛ خەمناک.
تلاوتل راکێشانی پڕ لە جەوری چۆڵەمە* و نیر*،
لە گەردندا پەتی خوێنینی نان و ئاو،
چەقەڵئاسا* چەق و لوور و شەڕە چڕنووکی سەر لاک*...
زەلیلی گڵ تەرەی بەستبوو* گڵەخۆرکە*، بێ چاو و گوێ.
لە خاک بانتر نەبوو رێ...

مچووڕکێک وەک بڵێسەی* گڕ دەماری دەرزیئاژن کرد.
لە دا ـ یک بوو لە ناخیدا هەسێکی چنگنی نامۆ.
بەری دنیای سە ـ وزپۆشی خەو و بەستەی لە چاو وون کرد.

دڕوویێکی چەتوون* پێکای دڵی شادی،

نە تەگبیری فریشتان نە عیلاجی پیری ڕێگازان،
نە هیچ سەرخۆشیێ، لاوان ـ دنی جوانیێ،
نە هیچ رامان* و تێڕوانیێ،
هەقی پێ کرد*...
زووێر* و گێژ و بێئوقرە،
تەریک و شێت و مەینەتبار،
غەریبی رابواردە و حاڵ
سەری هەڵگرت
بە دوای سەرتاڵی ئازاردا بەرەو عەرزی.

بە پارێز* هاتە سەر دوندێ.
پەرۆشی خورپە و ئاوات بوو، ملی رێی گرت.
سروودێکی بەتین دەنگی لە تالاری پەرستنگەی* دڵیدا
دەزرینگاوە:
«عە ـ ڕش پاک، ئا ـ سمان شینە؛ جیهانی بوون چ شیرینە!
سەرم سوورڕ ماوە لەم خاکە، لە رای ئەم تاقمە خەمناکە،
لە سوێی* ئەم گشتە ئازارە، لە گەند ئەم شوێنە خۆڵینە.
دڵم بریانی* دڵسۆزی، سەرم سەودای خەیاڵاتە؛
حەرامم بێ نەشەی مەستی هەتا ئێرە ڕکەی* ژینە.
لە سەریان لادەبەم تاپۆی سەوەی* گێلی،

کەوەی* بێخەوشی ئاسمانیان پێ دەنوێنم.
دەکەم پردێک لە نێوانی زەوین و عالەمی ژووروو؛
ئەمانە هان دەدەم بیکەن بە رێباز پردە بەردینە.»

لەگەڵ زەردەی هەتاودا بوو
کە پەیدا بوو لە ئاسمانی عەبووسی شار؛
سە ـ یر ، نامۆ ، فیتنەئاکار*...
شەقام وێستا ، هەناسەی بڕدرا باژێڕ*.
لە گۆ چوو پێی جم و جووڵ ، نیشت لە روخساری تەماشا
رەنگی سەر سوورِ مان.
لە بیرەو چوو زەنا* و هەڵپە* و پەلامار...
بە لەنگەر* راخوشی ئەو پەیکەری جوانی.
سیرەی باڵی هەواڵی قافی* سیمورغی*،
سریوەی* ها ـ تنی گیانی بەهاری سەوز.
هێمای* بێزاری گڵ بوو دیمی* رۆحانی،
هەرای* راها ـ تنی کێوی.
بە ـ رزتر شوێنی شاری کرد بە جێ و رۆنیشت
(ستوونێ مەڕمەڕ و مەیدانێکی بەشکۆ).
جمە*ی بۆرە و کەڵە* جمیا*، جەماوەر رووی زەوی هەڵگرت*
-نەیار و پەرت* و دڕدۆنگ و عەلەم دەرهێن*،

دەمی تاق* و دوو چاوی زرت*ـ...

لە گوێنی* دەردەداری کە بلاوێنن بە پەنجە شوێنی ئازاری
فریشتەی مات دڵی ئەسپارد بە سوکنا و کەیفی تیماری:
«دەبا بێن و ببینن هەیکەلی مەعنا.
دەبا تێر دەست بهێنن بەو پەلانەی دا کە هۆی باڵ گرتن و
هەستانن،
بکەن بۆن و بەرامەی ئەو بەرێ، دڵیان
بپشکوێ بە شنەی کوێستانی ئوستوورە.
بڵا* گیانم هەوێنێک بێ، بتاوێ و خۆش بکا دەریای هەس و
هۆشیان،
مرازێک* بێ نهێنیم بۆ تەرە بوون* و بڕینی ڕێگەی ئەو
دوورە...
دەروویێک* سا بڵێی پەیدا نەکەم بتکێمە نێو دڵیان؟
بڵێی مەشغەڵ بسووتێ و کەس نەڵێ نوورە؟...»
ووت و ویرەی* دەکرد بێدەنگ و هەسیا بوو* هەموو بەند
بەندی ئەندامی،
دڵی دەتواوە هێدی لە کوڵ و سۆزدا،
دەبوو بە سەد چەم و دەڕژا بە ئارامی...

سمێڵ بۆزێکی سەر قورسی گران و مۆن*
کە ڕێزی تاوە ترسێک* بوو بە سەر کۆمەڵگەدا باری،
بە دەعیە دەستی رادێرا و لە سەر تا پای فریشتەی بێسەدا
نواڕی*:
«موبارەک بێ، هەر ئەم دەعبا*یەمان کەم بوو!
چ مەکرێکی لە بن سەردایە تەپلۆسە*؟
چووە هەڵنیشتووە لەو بەرزە، دەڵێی ئێمە منالێن و
مەلامانە*.
کەسێکی نابەڵەد بێ وادەزانێ کەس نیە تای ئەو بکا* لێرە.
تەماشای لەخت و لاری کە، کوت و مت* عەینی مالۆسە*.»
تریقەی پێکەنین هەستا...
تیتاڵی* و تیز* لە چاو و دەست و دەم باری؛
قیامەت بوو فریشتەی بێپەنای قووت دا...
ڕوواڵەت هێدییێکی گێلی سەرمردوو*، بزەی ژیری لە سەر
لێوی،
بە ئەسپایی چووە پێش و پەلێکی لێ فریشتە هەڵپساند*،
دەیکوت:
«تەماشا کە، کوڕە ئەم پیسە ئائەم شاپەڕە جوانەی لە کوێ بوو؟
حەیف نیە تۆغا؟
ئەمە بۆ لاسەری ئەو کیژە خونچیلانەکەم جوانە

**-دەزانی، تازە پێی گرتووە-...»**
**تەنیشتیشی سەری بزواند:**
**«ئەرێ، کاکە! هەوای ئەم باڵەیە ئاوا هەڵی گرتووە!»**
**ئەوە بەس بوو؛**
**پەڕ و پۆی لق بە لق رنرا* و بنەبڕ* بوو.**
**هەرا و بگرە حەوێقەی* ئا ـ سمانی گرت،**
**جنێو و تەوسی جۆراجۆر کەوانەی کرد.***
**فریشتە گوێی دڵی دانێ.**
**تەکانێکی لە بەر چاو گوم نەبوو، بگرە**
**تەنانەت هیچ شەپۆلی رەنگی روخسارێ.**
**دەیانکوت: «ئێوە بڕوانن لە رەنگی مردووە ئازای**
**دڵی پیاو هەڵدەشێوێنێ؛***
**لە لا وێستانیشی شوومە، بەڵایێکمان بە سەر دێنێ...**
**چما* تاعات و نوێژی رێکە ئەم لووسکە*؟**
**دەزانێ بۆ مە چیان جێ هێشت حەکیمی مەزنی پێشین و**
**مەلای سانی[1]؟**
**لەبەر دەیلێ کتێبی پێشەکی و ئەنجام[2]؟**
**دەنا هیچ بایەخێک دەدرێتە سامانی؟**
**لە کامە کۆمەڵە و پارتێ هەیە نێوی؟**
**کوڕی کێیە؟ مرۆوی چی، بلێ کێوی!»**

به سەر رووی تەنگزە* جارێ قسەی رەقدا دڵی دەخشی،
لە گۆمی ناهومێدیدا پەلی دەکوتا بە ناکامی
کە پەیدا بوو لە ناکاو شۆڕە لاوێ تازە پێگەیشتوو.
غەریب رەنگێ، مناڵ رەفتارێکی سەرمەست،
چ لاوێ! ئادەمیزاد نا، لە جوانیدا لفی* خۆی بوو.
بە خۆی کوت: «بۆنی ناسیاو هات، بەری گرت داری ئاواتم؛
موحاڵە ئەم پەری شێوە بە گیانی جوانی نەگرێ خوو...»
بە بێدەنگی خزایە نێو جەماعەت، هات جەوانی شۆخ
هەتاکوو روو بە رووی وێستا.
بڵێ جامێکی* بێگەرد بوو کە راگیرا...
فریشتە لە فریشتەشێوە روانی و ئەو لە ئەم راما*،
رژانە یەک دوو رووباری ژیان و هۆگری و جوانی.
وەها بێهۆش و حەیران بوو تۆ دەکوت رۆحی ئەسپاردووە،
ترووکەی لێ نەکرد* تاوێ، هەتاکوو نووچی دا* و رۆچوو:
لە چەشنی پەیکەرێکی مەڕمەڕی بەشکۆ
لە ناخیدا شەقی برد هاتە سەر ئەژنۆ جەوانی مەست.
بە خۆی کوت:«من دەزانم عومری خۆشی بێدەوامە، ها...
بە سەر چوو دەوری دڵشادیم.
بە هیوا بووم بنێرمە خواس ـ تنی نەشمیل سبەینێ و دووی،

ئەوا دەرکەوت نیشانەی تاڵی نامرادیم...
لە عالەم ئاشکرا و روونە
کە نەشمیلی پەری‌ئاسایە سەرتۆپی هەموو کیژانی ئەم شارە.
کچان گەر گیانی ئەندامی سڕی شارن،
ئەوان ئەندامێکن بێگیان، ئەمیش گیانە.
ئەگەر گشت تاقمی نازداران سه ــ وز بن وەک چەمەن،
نەشمیل
لە چیمن بە تەنێ سەروێکی نازدارە...
گریم* نازداری دڵپەروەر نەکا زویرم*،
بە ڕادانی* رەقیب مۆر کا بەڵێن و بەینەتێکی* نوێ،
هەموو رۆژێ بنێ بونیاد لە باخی ئیشقی خەملێومان*
نەمامێکی گەشی تازە،
بە سروەی وەسڵ بلاوێنێ دڵ و گیان و هەس و رۆحم؛
نە یاری دەغەز* و مەکرم، نە ئەهلی سەر کزی و ژێریم،
فریوی خۆم چ پێ نادرێ، ئەمن ژیرم:
شیاوی شۆخی بێهاوشان غەریبەی قۆزی* جوانچاکە نە هی وەک من!»
لە خورپە و عەزرەتا* تاوێ وەکوو مارگەستە گرژ هەڵبوو*،
کەساس* و پڕ پەژارە هاتە دەر پاشان رەوی* سڵ* بوو.

لە جەزبەی لاوە رزگار بوو فریشتە هاتەوە سەر خۆی،
لە جێی تەوس و جنێو بەرد و پلار* بوو دادەباری بۆی.
شەڵاڵ* و ئاڵ* زامار بوو لەش و ئەندامی نازپەروەر،
سەری کرد ئایەرەی* تاقەت، کولّی سەند ئەو دڵەی پڕسۆ*؛
هەڵی گرت کۆڵی خەمباری بەرەو لای دوندی تەنیایی،
لە تالاوی زەلی بێئاوەزی* دەرچوو...
_چڕێکە* ئەو چیا ئامان، نەبینێ دوژمنیش چۆڵی!
جە-رگ هەپروون دەکا* سام* و پەژارەی نێو دەر و دۆڵی!

گەلێ رۆژان هەڵی کرد بێکەس و تەنیا.
گەلێ هاژی و تەنوورەی کرد* دەروونی کەیلی پڕخوێنی.
گەلێ وەک کووپەڵەی مەی رشتی جۆش و کوڵ.
جیهان تەنگ بوو لە بەر چاوی لە سوێی* ناسۆری* زامی دڵ.
سەری هەڵدا نیشانەی بێفەڕی تێک چوون.
_چ جێی تیمارە ئەم دەردە! لە کوێ تاوێ ستار دەگرێ*!
هەدا دان* و شفای چی بێ ئەوی بیگرێ!_

هەزاران جاری دی هات و
ملی نا بەر شەپۆلی قورسی ئەشکەنجە.
هەزاران باری سەرکۆنە و جنێو و لەعنەتی هەڵگرت.
چ مەیدانێ و ستوونی مەڕمەڕینی چی؛

**نەما شوێن و کەلێن و قوژبنی دژوێن***
**سەری پێدا نەکا سەد جار.**
**نە کێوی ما کە نەیدوێنێ**
**نە چنگن* و شەمشەمە کوێرە**
**کە پێوانەی کوتەی خوێنی* نەکا تۆمار*،**
**کەچی هەرگیز نەبوو تووشی تنووکێک رۆ ـ شنایی**
**دابمرکێنێ گڕی تاسەی.**
**پتر لێڵ بوو هەموو ساتێ بەری چاوی.**
**دڵی هیوانەماو قاڵبێکی بێگیان بوو کە دەیکێشا کەنەفت* و کز**
**بە دوای ئامانجی بەرباددا.**
**گەمە* و ڕێز و بەزە و ئازار**
**یەکێ بوون لە دەروونی زیزی ناشاددا.**

**دەهات و رادەبرد شێواو؛**
**سەدان ئەنگوستی ئیشارەت بە کەیف خۆشی دەیانپێکا***
**گۆناو و روخساری ژاکاوی،**
**سەدان شمشێری زەردەی* خۆ بە ژێر زانی**
**دەکێشران بۆ بڕینی جەرگی خوێناوی.**
**فرە* بێدەرد دەیان دا باری دڵسۆزی و**

به سەر شانیان دەکێشا دەستی پەند دادان؛
دەیانکردە نیشانەی تیری خۆنوێنی و فیشاڵ لێدان*.
چیها جەوری ووزە هەڵنەگری* بێئەنداز؛
چزاندن* و جەزرەبە دانی کە وەک مەرهەم
دەیان لە برینی نا ـ دیار و دەردی بێدەرمان.

پەل و پۆی دڵڕفێنی زینەتی سینگ و بەرۆک و لاسەری شار
بوو.
ببوو بە پەرچەم و نیشانی تەڕپۆشی،
بە باڵی تیری شەڕ، جووقەی* کڵاو و تاجی سەرناسی*،
درۆشمی* کۆمەڵە و تاقمەی ڕێ نیشان دەر.
لە دەریای فکری ڕەشدا ڕۆ دەچوو یەکجار
کە ڕۆژێ لە پەسیو*ێکدا بەری پێ گرت
زەلامێکی قەبەی* چاوهاری سەد تۆکڵ*،
رواڵەت سادەییێکی شێوەماخولیای جیهان بێزار،
دەماری* سەد بەسەزمانی* لە چارەیدا دەیان دا چڵ.
فریشتەی توند لە باووش گرت و رایمووسی هەموو ئازای،
سەری هەڵدا لە چاوی‌دا دنەی فرمێسک*.
بە باڵای هەڵگوت و لاڵاوە وەک یەخسیر:
«لە کوێم دیوی ئەوندە هۆگری تۆیە دڵم ئەی هاوەڵی گیانی!

دەڵێی رۆحێک بو ـ وین و چووینەتە دوو لەش،
لە خەودا یان ئەتۆم دیوە و بو ـ وم خووگیر.
دەزانم چی دەکێشی لە جەفای نائەهلی ئەم شارە.
مەگەر من؛ شاعیری خەمبار، چیە حالّم؟
سەزای وایە ئەوی سەر دانەخا بۆ رەسمی بێتەگبیر*.
چەنێ لەم حاڵە پاکانە*، چەنێ خاکەسەری* کردن،
ئەوندە کوڕنوشی برد بۆ فریشتە، خۆی گەیاندە حاڵەتی مردن...
لە دوای ئەو رۆژە قەت نەیدا لە دەست قازانجی دیداری.
زەرووئاسا* هەڵی دەمژی لە دەریای عیلم و هۆشی ژیر.
-بەهای* گیان و بەری* خوێن بوو،
خەزێنەیێکی غەنیمەتبابەتی دەسکەوتە هەر جوابێکی پرسیاری.

فریشتە تێی دەفکری بەو دوو چاوانی نیهان بینی،
دڵی وەک شووشە چاویلکەی منالۆچکان
دەدا بەر خۆری هاوینی.
بەزەییێکی بەسام بوو پاکی ئاکاری*.

ووتە داکەوت*؛ دەیانکوت شاعیری دڵناسکی بێچارە

**گەرەکیە ئەو حەلاماتە* بعاملێنیٚ*.**
**هەژارە ئەو دڵەی ئاخری بەڵاییێکی بە سەر دێنیٚ.**

**نفووسی* پاکی راهێنی**
**نواندی زوو بە زوو ئاساری پڕسێحری؛**
**مەڕام مەیسەر*، سەقامگیر* بوو هەموو کاری.**
**لە پەڕ تاجێکی کرد و نایە سەر ئەوسا**
**لە خۆرئاوا هەتاکوو خۆرهەڵات رۆیی سەدای شێعری.**
**چ فیرعەونیٚ! چ شەددادیٚ!**
**ئەگەر دەستی بدابا کەم هەتا کورتێک بە کەیفی بوو**
**لە سەر تەختێکی ئاڵتوون دابنیشیٚ و رووت و برسی بۆی بکەن نوێژیٚ.**
**لکەی بەرچاوی* بوو راهێنی* ئوستادی:**
**«بڵێی... ئاخ!... رۆژیٚ بیٚ بمریٚ و بە ئەو دەستانە بینێژیٚ؟!»**
**کەپووی* لیٚ گنج دەکرد چەشنی کەلاک و لاترازکەی لیٚ دەبەست*، دەیکوت:**
**«هەژارە ناشمریٚ رزگار ببیٚ... راستە دەڵێن شێتە؛**
**بزانە ئەو هەموو گەنجەی چ مفت هێنا و لە چنگمی کرد؛**
**رەجاڵ و بێنەوا* ماوە بە خۆی و رەنجی بەربادی!**
**بلیمەت* گەر ببیٚ خۆمم؛**

بە کاری چم دێ ئەو عیلمەی نەبێتە باعیسی شادی!
بەڵام ترسم هەیە گەلحۆ* شتێکی دی لە لا بێ و پێم
نەزانیبێ،
م ـ فت بیکاتە دەستی رۆڵەیێکی دی.
دەترسم من ببینێ چم بە دی هێنا لە کاڵای* عیلم،
کزی و ساویلکەیی* خۆی بێتەوە یادی؛
دەسا با خۆم سەری یەکجار بچەقێنم*.»

فریشتەی دڵبریندار، ئەو جەفاکێشی غەریبدیدار،
گوڵی سەر تۆپی عەرش و زینەتی لووتکەی تەماوی قاف،
شکا و تێک چوو...
نە ئامانجی بەڕێوەبەر،
نە ئاوات و دنەی ژیوار*،
نە ئۆقرەی بوو لە هیچ شوێنێ،
نە بۆ ڕێییێک دەبوو ڕێبوار.
نە تابشتی* چیای سامناکی تەنیایی،
نە توانای چۆڵی خولیایی،
بێزاری هەستی گوێ و چاوی؛
بەری دا دەست!...
شڵێژا عالەمی مەندی فریشتان و

گەڕا ئاسمان لە بای باڵی.
زەوی چڕزا* لە ترپەی پێی.
سەرت ڕاکە*!!
دەبێ کوێ وا بەرین* بێ بتگرێتە خۆی؟!
مناڵانی نەگووراوی محاڵی* نوور
کە باڵغ بوون،
لەوانەن هەڵگرن شوێنت...

لەگەڵ کازیوەدا کاتێ دەبوو پەنهان،
پەرۆشی* دی ـ تنی لاوێکی جوانچاک بوو
کە چۆک بۆ گیانی جوانی دابدا و، شەیدا،
قەدی شازی* بکاتە داری ئاڵا بۆ درۆشمی* ڕۆژ!
بەڵام ئەفسووس،
خەوی ئاڵۆز بوو یان وا بوو،
ئەوەی ڕۆژێکی ئەو دیبووی؟
ئەگەر وا بوو، بۆ جارێتر نە پەیدا بوو؟
نهێنییێک* بوو نە پەی پێ برد:
دلێری لاو هەر ئەو ڕۆژە بە تیغێ جەرگی خۆی شەق کرد.[٣]

خەرمانانی ١٣٧١
بۆکان

---

[۱] حەکیمی مەزنی پێشین و مەلای سانی: مەبەست کەسانێکی تایبەت نین، واتە فڵانە حەکیم و فیسارە مەلا.

[۲] کتێبی پێشەکی و ئەنجام: مەبەست کتێبگەلێکی تایبەت نین. لە هەموو زانستێک‌دا، بە تایبەت لە زوودا، کتێبگەلێک بەم نێوانە بووە.(مقدمە و منتهی)

[۳] ئەم شێعرە پێشتر لە گۆواری ئاوێنە، ژمارە **۱۲**، ساڵی **۱۳۷۲**دا بڵاو کراوەتەوە.

«عومرێکە چاوەڕوانی دەکەم کە هەناسەیێک بدەم
بە دزی دڵمەوە و دڵم ئاگای لێ نەبێ؛ بۆم ناکرێ.»
(شێبلی)

## *«ساتی گێژەن»**

بەرانبەری ئاوێنەی خۆرئاوا وێستام،
وەک منالێم گەشکە نەبووم؛

ماسییێکی بەستەزمانی پشووبڕاو
لە سەر توێژێک سەهۆڵی رەق
هەڵدەبەزی و
ژێرەکەی ئاوی رەوان بوو.

سۆفیلکەیێکی نوورانی
بە بڕوای دڵ
ئامۆژگاری سیخوار* و کڕێوەی دەکرد،
لە نێوەی رێ بگەڕێنەوە.

کاروان کاروان
سەماکەری بێپەردەی مەست تێ دەپەڕی و

**حەماڵێکی برسی کەنەفت***
**کۆپانەکەی* دەدا ژێر داری پردەکان؛**
**نەکوو ڕێگاکە تێک بچێ...**

**ئەی من کوانێم؟!...**

**بەرانبەری ئاوێنەی خۆرهەڵات وێستام،**
**شۆرباوی پڕزەردەچێوەی دڵتۆرێن* بوو**
**کە هەڵدەچوو.**

**چوومە ژێر سێبەری سەروێک،**
**سینگم دایە بەر شنەبا،**
**سەرم نا بە گوڵزارەوە،**
**گوێم بۆ جریوەی مەل ڕاگرت،**
**لە ئاسمانی بێگەردی شەوگارم ڕوانی،**
**وەک منداڵیم گەشکە نەبووم.**
**ئەی من کوانێم؟!**
**لە کوێ بوو جوانیم بە جێ هێشت؟**
**لە کوێ بوو خۆمم لێ گوم بوو؟**

سەدان سەف بووین
ئەو رۆژەی کە بەرانبەری
تراویلکەی* ئەوین وێستاین؛
هەر لە مندا بوو بە گولی و بەری نەدام!
زۆر لەمێژە وەک منالێم گەشکە نابم.
لێم گەڕێ با لەگەڵ دڵی خۆم بم و بەس،
چاک دەزانم لە کوێ بوو کە خۆم بە جێ هێشت!

١٣٧١/١٢/٢٣
تاران

## «لە بەر تیشکی ڕەشی هەتاوی ئەمڕۆکەمدا»

پاییزە و سەرما بزوونە،
دیسان
هەورێکی ڕەش دایگرتووە دەوران دەوری ئاسۆی کورتی
ئەمماڵۆچکە* ڕووت و چۆڵە.
پاییزە و سەرما بزوونە،
دیسان
ڕەوەزی* سارد و سڕم خۆش دەوێ،
دەرەی بێدەنگ،
پەڵە جاڕی خشە و چرکە تێدا نەماو،
شێوەردی بەرفرەی* بێبوار،*
تەپەی سووری بەیاری* پڕگوێنی* و دڕوو،
شاخی خەوتووی ڕەش داگرساو،
سام و رازێ لە سەر نیشتوو،
کوڵە باڵتەیێکی* بێپێز*
کە بیپێچم لە خۆمەوە
هەر دەم بە ئارەزوویێکی
تیژتر لە دەمەکەی پێشوو.

**پاییزە و تاو تاو دادەکا**
**خوناوەی ساردی چەند وەرزم**
**بە سەر هەردی ئەمماڵۆچکە تار*ەدا و من**
**دوور کەوتنەوەم خۆش دەوێ**
**لە ئاوایی،**
**لە سەرنجی هەموو چاوێ.**
**زریانێکی پشوودرێژی بێ چاو و روو**
**هەڵیکردووە**
**لە سنووری خانووچکەوە،**
**لە دەم کەلی ئەو مەڵبەندە رەنگینەوە**
**کە کەس سڵی**
**لە سەرنجی دانیشتووانی نەدەکرد،**
**ئێرەیی* رێی پێ نەبردبوو،**
**سیرێژ* و رۆن**
**پێخۆری هەرە خۆشیان بوو،**
**بە تریفەی مانگ گەشکە دەبوون**
**تا پلەی شێتی.**

**یەخسیرەکەی**
**دەستی هۆزی ئەشکەوت نشین!**

دەغیلت بم،
چ حەزیاییێک لە دەروونی تۆدا دەژی
وا نابەزێ؟!
جەرگت کام لووتکەی دنیایە
کە بڕبەندی* هیچ مەینەتێ
تەنکی ناکا؟!
بە سەرسەری*
هیچ کوێرەوەریێ ناخزێ؟!

پایزە و لوورەی
زریانێکی نەسرەوتی دڕ
لە پشتی چەند قۆناغەوە
رووم تێدەکا.
لەشم وەکوو ژیکەوانە* وێک دێتەوە و
گەرمی لە دەروونما نیە،
نەرمە یاوی* تووانەوەی دڵم نەبێ.

دیواری ئەم گۆنگە* رەشە
پەراسووم گۆڕەوشار دەدا،
شان و پیلم سست دەکات و

دەیخواتەوە.
ئەرێ لە کوێ کۆتایی دێ؟!

ئەی هەتاوی ئاسۆی بێتەم!
ئەی پشووی هەوارگەی کوێستان!
زستانی جووتیاری پۆشتە!
کۆڕی بەرخۆڵەی زاووماک*!
تۆپیپێی سەر گۆڕەپانی*
ڕێبازی بێ گەڕانەوە!
ئەستێرەبارانی تافی* چووزەرە* و ئارەقی لاسوور!
خولی مەستانەی نێو ئاڵقەی
نوێژی کەونارای* باپیران!
تێزانی رۆژ
لە باخ و کونجی نەدیودا!
پۆلە ئاسکی ئەکادمیاکەی ئەفلاتوون!
ئاسمانی پێشبڕکێ و جەنگی
سەد گەلاوێژی پڕحەسرەت
لە دەوری رۆچنەی هۆدەکەم*!
ئەی ئەو سەدان کۆترە سوورەی
بە نهێنی* بۆم بەڕێ کران
کەچی هەرگیز نەچوونەوە و

**پێیان وابوو کە نامگەنێ!**

**هەستانی چۆمەکەی پیرۆز**
**لە تاڤگەی نێوان سەرچاوە و**
**دەریای خامۆش**
**کە خنکێنرای**
**لە پشت دیواری تەپیوی**
**بەندی کۆندا!**
**من نەژیاوم!**
**من نە-ژیاوم و ناشمرم!!**
**مردن هەرگیز پێمەوە نانووسێ*،**
**هیچ گۆڕێک نامگرێتە خۆی،**
**تۆزم لە گەڵ**
**هەر خاکێکدا تێکەڵ ببێ**
**هەڵدەستێ دەکەوێتە ڕێ،**
**سەد قۆناغ پاشی مەرگیش بێ**
**هەر دێمەوە.**
**من نەژیاوم!**
**من نە-ژیاوم و ناشمرم!!**

**پاییزە و گەڵاڕێزانە.**

دڵم بە ئاستەم لێ دەدا.
بەرە بەرە*
ووشک دەبم و زەرد هەڵدەگەڕێم؛
لەوانەیە سریوەیێک*
جۆلانێم پێ بخا و بمبا.
پێم وا نیە
بتوانم بەر لە ئێوارە
ئەم کۆڵە بگەیێنمە جێ.
ئاواتی دی ـ تنی هەتاو
تەنانەت لەم دەم ئاسۆشدا،
مەیلی پشوویێکی ئازاد
لەم دەشتە خەزان لێ داوەی
بێ ڕەنگ و بۆنەی ئەمڕۆشدا،
دەترسم بۆ ئەبەد نوقمی
دەریای تاریکایی شەو بێ.

پاییزە و سەری ئاسمانی
ئەم ماڵۆچکەم لێ وێک هاتووە.
لەرزێک لە ناخمەوە دێت و
دەم لەگەڵ دەم
توندتر لە خۆمی دەپێچم

ئاتەگی* کوڵە باڵتەکەم.
لەگەڵ خوناوەی* چەند وەرزدا
خۆم بۆ پەنایێک دەکوتم.*
خۆم بۆ پەنایێک دەکوتم!!

١٣٧٤/٦/٢٩
نێو قەتاری مەراغە _ تاران

# لە کومە ڵەی «مەرگی سۆراب»

**چاپی یەکەم ١٣٨٧ ک.ە. (٢٠٠٨ ز)**

«بێداد»

لەشم وەک کۆتەیێکی تەڕ
جنجندەکەم
بە دەمی تەوری پەنجەکەم،
دەیخەم بە گەرووی کوورەی خەیاڵما
تا ئاگرێکی لێ بەرپا کەم،
ئەی هاوار ئێرە چ ساردە!

بەهاری ١٣٧٢
تاران

*«تاسە»**

پێیێکم لەنــێو شەقامەو یەکم لە نالەشکێنە*.
ئەم لووتکانەش ئەوندە لەگەڵم خۆیین
کە ناسیاوانی دێرینە.
لەگەڵ گشتیان،
بەردەزەرد هەتا تەرەغە و
بێژنگ‌بەسەر و کەڵتەگە و
تۆڵەکە و ئەوانی دیکە، *
هەموو ڕۆژێ
بەگەرمی لێک دەپرسین و
دیسان لێک دەپرسینەوە.
کە زەردەپەڕی* سەر لووتکەی
بەفراوی و تازەی ئەم شاخە
دەوروبەرم دەڕەنگێنێ و
ماندوویەتی جەستەی کفت* و چاوەکانم
لە پانایی پڕگردوولکەی*
پێدەشتەکان‌دا ڕادەخەم،
ڕوانگەی شاری ئەفسانەیی
شازادەی شۆخ و دڵپاکی گۆڕغەریبم

کەسک* و ئاڵ* و گەش و پاراو*
لە تۆی پەردەی
تەم و دووکەڵی چڵکندا
دەم بە دەمێ خۆی دەنوێنێ و
دیسان بزر* دەبێتەوە.
بەم دیمەنە
دەبم بە دڵۆپێک فرمێسک،
لە ڕۆچنەی دڵمەوە دەتکێم.
خڵتەی بەهاری ڕابوردوو
وەک ژانەسەری دوای مەستی
جەزرەبەو ئازارم دەدا.
تاپۆی* ڕەشی چارەنووسی دیاریکراو
لای دەستمەوە هەڵدەکورمێ* و
دڵڕەقانە بزەی دێتێ.

چ بەزمێکی گریاناوی پڕهەنیسک بوو!
چەندە ماندووم!
بیر لە خەوێکی دڵووریای
درێژخایەن دەکەمەوە.
بیر لە سەر لووتکەی بەردین و

## تازەی شاخێ.

ڕەنگە ئاوا
لەم قولینچکە* تەنگەبەرە ڕزگاریم بێ و
بکەومە سەر شاڕێی هەتاو؛
بچمەوە نێو تاریکانی
ڕۆخی* ڕووباری کاکێشان*.
ڕەنگە ئاوا ئەم لووتکانە
تەلیسمی بەزمی بەردینی
خۆیانم لا بدرکێنن و
لەگەڵ ڕەوتی شا ـ دمانی
کاروانی بێ ووچانیاندا
فەرامۆشی تەنیاییم بێ.
بروسکە و گزینگ،
بەفر و باران
لە سەر دوندی ئەم شاخانە
ڕووناکتر و تازەترن.
ئاوونگی* بەیانی بەهار
ڕووتڕووت لە پێستم دەنیشێ.
شنەی چالاک
نەرم و نیان* و فێنک و ڕۆحسووک*

**قاوەڵتوونان***
**لە نــێو ناخی سروشتەوە**
**پەیغامی ئاسوودەیەکی ڕەپستەییم***
**بۆ دەهێنــێ.**
**هەتا جەنگەی تەنگەنەفەسی نیوەڕۆ**
**لە نــێو شینایی بێ بنی ئا ـ سماندا**
**سەیری سەمای جورڕەپۆپنەی قەشمەر* دەکەم.**
**گوێ لە هەوی کوڕکوڕ* دەگرم.**
**بۆنی هەناسەی گیا دەکەم.**
**بە جریوەی مەلی ئێ ـ سک سووکی* ڕێبوار**
**خەتی ڕەنگین دێنم بەسەر**
**مینای* بێ گەردی دڵمدا.**

**خرمەی پۆتین لەلام هەستێ یان گرمەی هەور،**
**خێرا گوێقوڵاخی* دەبم؛**
**خەڵــکی ئــێرەم!...**

**ڕەنگە ئەوسا بۆم دەرکەوێ**
**ئاوی خۆشی حەوزەگەورە**
**لە کوێوە دێ.**

ڕەنگە بکرێ
نەبەردی دوازدە پاڵەوان
لە دەمی شەنگە* ببیستم.
لێی دەپرسم: «ئەو شەوەی کە
لەشکری تێکشکاوتان لە
شەبیخوونی* ئەفرا ـ سیاو* ڕزگاردەکرد،
بۆ نەتاندا لە گەردنی
ترسەنۆکانی ڕاکردوو»
لێی دەپرسم:
«ئەرێ تۆ ئەهوورامەزدا؛
کێ بۆ مەرگی حەفتا و هەشت گۆدەرزی* گریا؟»
پێی دەڵێم کە باسی فەڕ و شکۆی سیاوەخشی کۆلیل
باسی داد و دڵئاوایی و فریشتەخوویی کەیخوسرەو
بۆ من بکا.

ڕەنگە دیاکۆ ببی ـ نم و داوای لێ بکەم،
بەسەرهاتی ژوانگەی ئاشوور و بابلم
بۆ وەگێڕێ.

ڕەنگە ئاوا ئەم لووتکانە

**بە درێژایی شەوی بەردین**
**خۆشخۆش دڵم بدەنەوە و**
**پەڕەسێلکەی پەڵئاگرین**
**نەورۆزان بێن**
**لە حەسرەتی مینای* دڵم بخۆنەوە**
**تا سەرئەنجام**
**فەرامۆشیم دێ و دەسرەوم.**

**١٣٧٤/١٠/٣٠**
**بۆکان**

## «ژوان»

**بە چ نێوی بانگت بکەم؟**
**بە چ چاوێ تێت بڕوانم؟**
**تۆ دڵبەرەکەی جاران نیت**
**یان دڵی منە مردووە؟**
**ئەم سەرما چەتوونە چیە**
**کەوان تێم دەئاڵێ؟**

**چ نزاییێکە* ئیشقی تۆ ،**
**چ دێوێ جادووی لێ کردووی**
**وا ئەنجامی ئەویندارێت**
**جەرگی گەرمی خۆڵەمێشە؟**

**چاوەڕوانی لاواندنم لە تۆ نیە؛**
**خۆڵیشت لێ بەبا ناکەم*.**
**بە خێسەوە تێم مەڕوانە؛**
**تانەت هەناوم* ڕەش دەکا.**
**کەی من ماندووم؟**

من و کۆڵ دان؟
کێیە لە من نەبەرد*ترە؟
فیزیش* ئەندازەی بۆ هەیە!
پێت وانەبێ ئاگادار نیم
کە ڕەونەقی بازاڕی سەر کۆڵانی تۆ
هەر جەرگی شەقاری* منە.
لووت بەرزەکە!
ئالەم دەمی گەڕانەوەی هەتاوەدا
کە گوڵ بە باووش سیس دەبێ و
گەرمی و بزاو*
بە تاڵووکە* لە هەرد و دیار* دەتارێ،
نامۆیی* گەمارۆم دەدا*؛
نەچیری ڕەوەکی* شادی
سڵ* لە داوی سپیم دەکا.
مەرگم بەلاوە شیرینە،
گۆڕان و تێکچوون دەمکوژێ!
تۆ پێم بڵێ،
سەرم چۆن بە ـ رز ڕابگرم؟
سکەی جوانی بە چ ڕەنگێ*
هەتا لێواری گۆڕ بەرم؟

کێ لاوی منی دیتووە؟
کێ دەزانێ لەپێی تۆدا
من چیم کێشا؟
چەند وولات گەڕام بەشادی،
چەند نازداران گەلگەل هاتنە سەیری باڵام،
بەڵێنێک بوو بە تۆم دابوو،
هەرگیز سەرم
لەسەر قاشی زین هەڵنەگرت.

تەلی ـ سم بوو یان خەونی تاڵ
بەرەو ئاکامی* خۆی دەچێ.
لاویم وەکوو شەپۆلێکی تووڕەی زەریا
لە ڕەوەزی* ڕۆخی* کوێرەوەری تۆدا
شکایەوە و
ئەوا بەسەر بەدبەختیتدا
هێدی هێدی
بەرەو نێرینەی* ئاوەکە
دەکشێتەوە.
دەزانم سەرئەنجام کەڵــکم*
دەکەوێتەوە سای باڵات.
پێم وا نیە

**ئەوساکەش بتپەرژی دالْدەی***

**ئەم دلّە شەکەتەم* بدەی.**

**خاتری شۆخیت*!**

**بەلّام خۆزگە**

**لەم گێژەلْووکەی نامۆیی و تێکچوونەدا،**

**لەم سووک بوونە بێچوونەدا*،**

**دەهاتی فێرت دەکردم،**

**لانکەی دلّم چۆن ڕاژەنم.[1]**

**١٣٧٤/١١/٥**

**بۆکان**

---

[1] ئەم شێعرە پێشتر بە دەستکارییێکی ناڕەواوە لە حەوتەنامەی "ئاویەر"، ژمارەی **١٤**، ساڵی ئەوەڵ، شەمبە **٢٩** سەرماوەزی **١٣٧٦**، لاپەڕەی **١٠**دا چاپ کراوە.

*بۆ حەوتەمین ساڵی شەهید بوونی هەڵەبجە*

**«حەوتە»**

لەبەر بلێسەی* ئا ـ گری
ئێوارانی کوڵەچوارشەممە و نەورۆزدا،
بە هانای* ئامێزی شەماڵ،
بە ب ـ ریسکەی ئا ـ سمانی پیرۆزەیی* و
گەشەگەشی سەوزی زەوی،
بە قریوەی کۆڕی کایەی
باڵندە ووردیلەکان و
سیرەی* باڵی باز و هەڵۆ،
هاوڕێی شنەی دارستان و
خورپەی ئەوینێکی تازە
لە دڵی گەردوونی* کۆندا،
بەستەڵەکی* دوندی سەرم
هێدی هێدی دەیکاتەوە و
چۆماوی چاوم سەر دەکا...

- ڕووی حەوت ساڵ بوو
ئەم سەهۆڵبەندانە چڕە

لەگەڵ هەتاو و شەماڵ دا
شەڕی دەکرد؛
شل نەدەبوو و نەدەچووەوە.-
دڵی پێکراوی حەوتساڵەم
کەوتووەتەوە دارەدارە* .
مەلی باڵشکاوی شادیم
هاتووەتەوە هەڵفڕین و
ووچان ووچان لە هەناووم‌دا باڵ دەگرێ.

حەوت نەوروز بە سەر کۆچت‌دا تێپەڕیوە و
کەچی گڵکۆت* هەر تازەیە؛
هەر تازەیە و لە نێو ئەم دەشتە سەوزەدا
قو- رس قو- رس
لە چاو دەدا و
پاکی دەشتەکە پڕ دەکا.
تەنانەت* بەری ئاسمانیش
لە چاوی بینەر دەتەنێ.
لە ژێر خاکی گڵکۆکەت‌دا
بەهار یەکجار گوم دەبێت و
پشتی گەردوون چەوتی دێنێ.

چ دڵ ڕەق بوون
ئەو شاعێرانەی یەکەم ڕۆژ
بە باڵای تۆیاندا هەڵگوت.
باری خەمیان چەندە سووک بوو
ئەو چاوانەی کە یەکەم ڕۆژ
لە بەرانبەر تەرمی تۆدا
فرمێسکیان ڕشت.
ئەو دەمانە
شێعر کراسێک بوو حەریر
دەیانکردە بەر بڵێسە،
پەرژینێکی ڕیحانە بوو
لە بەر ڕەوەیەک گا و کەردا،
قنەقنی* گڕی مۆمێکی باریک بوو
لە هەتاوی نیوەڕۆی مانگی پووشپەڕدا،
لایە لایەی پڕشیرین بوو
بۆ خەواندنی
کۆرپەیەکی داپڵۆخاو* بە سووتانەوەی کیمیایی.
ئەو دەمانە
فرمێسک بەر لە جێهێش ـ تنی ئاسمانی هەست
ڕچی دەدا* و لە جێگەی خۆیدا دەمەیی* ...



لەگەڵ گە ـ رم داها ـ تنی سەری چیا و
هەستانی دەنگی زایەڵەی* چۆماواندا ،
لە حەوتەتدا ،
ئارام ئارام تەمی سەرسامیم* دەڕەوێ و
فرمێسکم دەتەقێتەوە.
ئای دڵم چەندە لەکوڵە!
ڕووی حەوت ساڵە لاواندنەوەت
لە گێژاوی* دەروونمدا
پەنگ دەخواتەوە و خولدەدا و ڕێ دەرناکا ...
دەبێ ئەزموونی سەرپاکی کەڵەشاعێرانی مێژوو
کۆکەمەوە ،
دەبێ بچم لە گوندی سەر کوێستانان و
لاپەڕەکانی ئاوێستا
واژە بچنم ،
دەبێ بچم هەگبەیەک* لە
شریخەی شێتی برووسکە و
لوورەی پڕ بە ئەوکی* زریان ،
هەگبەیەک لە

گوڕڕەی شێری نێو گەمارۆ و
کاڕەی بەرخی جێماو لە ڕان،
هەگبەیەک لە حەوت مووسیقای
دەندووکی سێحراوی قەقنەس*،
هەگبەیەک لە
هۆرەی سەوزی شاخەوان و
ئاهەنگی چەمەرێی* دوایین
سەردارانی شەهیدکراو
کۆکەمەوە؛
لەگەڵ سۆزی بەیتبێــژانی چەرخی کۆندا
لێکیان دەم و
لاواندنەوەی سووری تۆی پێ بهۆنمەوە ...

هەیلۆ... گەلۆ...
هەیلۆ... گەلۆ...
گەلی هاوخوێن و ڕەگەزان!
شەوگاری وەرزی زستانی
ئەم وولاتە زۆر درێژە؛
بێت و بچنە تۆی جێگاوە
قەت ڕۆژتان لێ نابێتەوە.
لەم شەوگارە تووشانەدا*

**فکرێکی دڵهەژێن* بێنن،**
**هەستێکی خەوتارێن هەڵکەن،**
**درگاو بانتان داخەن لە سەر**
**ڕەوەی ئەو بیبیجانانەی***
**لە هەواوە هێرش دێنن،**
**ئاسۆی بیستنتان سامال کەن،**
**ئەوسا بێنن، گوێ لە سۆزی**
**ئەم هۆرە پڕخەمە بگرن:**
**پادشایەکی بەساڵاچوو**
**جەرگی ڕزی.**
**پزیشکان لێی ناهومێد بوون.**
**جادووگەرێ لێی پەیدا بوو،**
**کوتی: «چارەت**
**گۆشتی دڵی کوڕێکی هەشت نۆ ساڵانە،**
**کاکۆڵ زەرد و چاوکەژاڵ و ڕەزاسووک* بێ،**
**ژیان وەکوو چاوگەی گڕکان**
**لە چاوەکانی هەڵقوڵێ و**
**هەر چوار دەوری ئاسۆی نیگای**
**پڕ بێ لە پەلکەزێڕینەی خۆشەویستی.»**
**شا لــێی سوار بوو؛**

**بە ڕەوەیەک تولّە و تانجی و**
**نۆکەر و کاسەلێسەوە**
**کەوتە وولّات.**
**گەڕا ... گەڕا ...**
**مەلّبەند بە مەلّبەند، شار بە شار، هەموو سنوور؛**
**بێهوودە بوو،**
**هەتا هات گەیشتە شارەزوور.**
**چێشتەنگاوانێکی فێ ـ نک**
**لەنەکاو لە بەربەڕۆچکەی***
**کەناری خانەقاییێکدا**
**نەچیرەکەی خۆی ناسیەوە؛**
**بەچکە جووتیارێ بوو برسی،**
**بە بەرگێکی شڕۆلّەوە**
**کزکەی کردبوو هەلّدەلەرزی.**
**دلّی پادشا پێی خەنی بوو؛**
**گەشکەی* لێ هات.**
**چوار پێنج کیسە زێڕ و زێوی**
**بەملاولادا دابەشیەوە؛**
**وولّات کڕ بوو.**
**هەر لەو شوێنە**
**هەلّیواسی بە کاریتەی**

قەڵایێکی لاڕووخاودا و
دڵی بەگەرمی دەرهێنا.

هەی لۆ... گەلۆ...
هەی لۆ... گەلۆ...
گەلی بڵاو، گەلی بێ پۆ!
بێگانە دۆست و دوژمنی نە بۆ هەیە؛
پاک و پیسیان بەیەکەوە هێرش دێنن.
هەودای* ڕەوەی ئەهریمەنی
بیبیجانگەلێ بپسێنن
کە لەوبەری زەریاوە دێن،
لە مەڵبەندی بێگانانەوە هەڵدەستن؛
دڵتان ڕاست کەن،
ئەوسا ئامێزی بیستنتان
لە باڵای بەستەم وەرێنن.
ئەم شیوەنە بەری دوورە:
ئەو دەمەی گەردوون دادەنرا،
لە هەرچی کە دەبوو نەبێ
بۆ نموونە یەکیان سازکرد.
بۆ بەرگری لە فەوتانی

تیرەگەلی گیانلەبەران
دەبوایە هیچ گیانلەبەرێ
هاوتیرەیانی خۆی نەخوا؛
تەنیا دوو جۆر
لەم قانوونە هەڵاوێزران*:
گورگ و مرۆو.

لە گەلی گورگاندا باوە ،
لە سەهۆڵبەندانی تووش*دا
کە نەچیر سەخت دەست دەکەوێ و
برسیەتی هورووژم دێنێ*،
ئەو گورگەی بۆنی خوێن بدا
ئەوانی دی بە هەموویان
لەت لەتی دەکەن و دەیخۆن.
نازانم کە گەلی مرۆو
لە چ دۆخدا* و بەرانبەری چ قانوونێ
یەک هەڵدەدڕن ،
بەڵام ئەوندە دەزانم
لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی بیستدا
لەشی سواوی شارەزوور
بۆنی نەوتی لێ هەڵدەستا؛

**بە بەرچاوی گشت مرۆوی سەرزەویەوە**
**لە چەند لاوە دەمیان تێژەند*،**
**لەت لەتیان کرد و خلیان دا* ...**

**هەی لۆ... گەلۆ...**
**هەی لۆ... گەلۆ...**
**گەلی خافڵ، گەلی خەوتوو!**
**گەلی گیرۆدە بە داوی**
**سەدان تەلیسمی یەکگرتوو!**
**کات و ساتتان بە چیەوە تێپەڕ دەکەن؟**
**شەپۆلی ئەم بیبیجانە نامۆیانە**
**وەکوو ڕەوەی جندۆکە وان؛**
**هەتا بەخۆتان دەزانن،**
**لە خوێنتاندا گەرا* دەخەن،**
**لە دڵتاندا بنج دەکەن و**
**وەکوو مێشێ کە جاڵجاڵووکە خواردبێتی،**
**بۆ تێکدانی ڕواڵەتتان**
**هەموو حەشیای سەر و سینگتان**
**بەتاڵ دەکەن.**
**وەرن گوێ بە من بسپێرن.**

ئەم هاوارەم
بۆنی سۆزی بەیتبێژانی کۆنی لێ دێ.
هەوای سەردەمی بەهاری ڕسکانی* ئێوەی لەگەڵە.
ئەم هاوارەم دووعاییێکە*
دێو و درنج دەتارێنێ .
وەرن لە پشت ئەم بەستەیەم
شیری دەنگتان
لە کێلانی حەپەساویتان دەرکێشن.
سەرەڕۆیی* سەرئەنجامی سەر ڕۆیشتنە!
ئەم تەلیسمە یەک لەسەر یەک تەنراوانە
هەر یەکەی بەسەرهاتێکی هەیە بۆ خۆی:
سەردەمانێ دەستەییێک دێو
ڕێیان کەوتە ئەم وولاتە.
بە شاخاندا هەڵیان ڕوانی،
گشت لووتکەیان لە هەوردا بوو.
لە دەشتەکان مۆن بوونەوە،
بژوێن* بژوێن، پڕ بوون لە چۆماو و کانی.
چی گیانلەبەر و باڵندە و مرۆویش بوو،
پاک نوێنگە* بوون بۆ ژیان و شادی و جوانی.
دڵیان داخورپا و سەرسام* بوون.
بە سەرسووڕی لە نێوچاوی یەکتر ڕامان.

پاش مشت ومڕێکی سەرپێیی
گە ـ یشتن ئابەم ئەنجامە
کە ئەگەر بێت و بای نەورۆز
لەم وولاتەدا هەڵبکا،
دەبێتە بنکەی ئەهوورا* و
تازە هەرگیز
بۆ باری ئەوان دەست نادا.
هێنایان بۆ دابین کردنی
پاشەڕۆژی دووری خۆیان
تۆوی دارێکی ناپاکیان تێدا چەقاند.
دارێکی وا
بۆنی گوڵ و تامی میوەی هەر لقێکی
بوغز و کینەی هۆ ـ گرانی لقانی دی
لە دڵی پیاودا دەخولقاند.
ساڵ هات و ڕۆی؛
داری شوومی ئەهریمەنی
وەک فریزوو*
سەر لەبەری ئەم خاکە پیرۆزەی تەنی.
پاش دەیان ساڵ
لقی گەورەی

لە شارەزوور هاتە بەر و
دێوەگوڵێکی ڕەشی کرد
کە بە بۆنی ژەهراوی خۆی
هەرچی ڕووگەی ژیان و ڕووناکایی بوو،
چی بەرز و ئەهوورایی بوو،
خاپووری کرد*.

هەی لۆ... گەلۆ...
هەی لۆ... گەلۆ...
تاقانەکەی هەموو گەلان،
دەروونم چەند کەیلە* بۆ تۆ!
لە حەوتەتدا
هێدی هێدی
تەمی سەرسامیم دەڕەوێ و
بەستەڵەکی دوندی سەرم دەیکاتەوە.
فرمێسکم دەتەقێتەوە و
دەرەی چاوانم سەر دەکا.
گەمی شێعرم خۆل دەخوات و نو ـ قم دەبێ.
لاواندنەوەی سووری تۆ چۆن بهۆنمەوە؟
خاکی تەڕی گڵکۆکەی تۆ
بەهار یەکجار دادەپۆشێ و

**پشتی گەردوون دەنەوێنێ.**
**شەهیدە سەرفەرازەکەم!**
**سەدان ساڵە چی بەڵـگەی بوونی ئێمەیە**
**دەید ـ زن و دەیسڕنەوە؛**
**تۆ بەڵـگەی هەبوونی ئێمەی**
**- ئەگەر نەبواین،**
**بۆ چەسپان ـ دنی* نەبوونمان**
**ناچار نەبوون بمانکوژن.-**
**تۆ خوێنەکەی سیاوەخشی؛**
**هەموو ساڵێ**
**لەگەڵ هەتاو و شەماڵدا دەژییێتەوە.**
**بەرە لە دوای بەرەمان و پشتاوپشتمان**
**سەر لەنوێ دەتدۆزینەوە،**
**سەر لەنوێ دەتهۆنینەوە ...[١]**

**١٣٧٥/١/١٥**
**بۆکان**

---

[١] ئەم شێعرە پێشتر لە گۆواری "ئاوێنە" ژمارەی **٢٩- ٢٨**، ساڵی **١٣٧٥**، لاپەڕەی ١٦- ١٤دا چاپ کراوە.

*«کجا گنـجد او در جهــان فـراخ*
*بدان فرّ و آن بُرز و آن یال و شاخ»*
*(فردوسی)*

## *«مەرگی سۆراب*»* ١

١
**کەم بگەڕێ؛**
**زەوی هەست بە بوونت نەکا!**
**خۆت حەشار دە؛**
**ئا ـ سمان نەکوو بتبینێ!**
**چاوی پیست لێ بەدوور بێ،**
**دە ساڵان و ئەم باڵایە؟!**
**ئـێرە - گیانە – گۆگەڕۆکی* کۆیلەیانە،**
**کێ تاقەتی**
**دیداری هەرەپیاوێکی* وەک تۆی هەیە؟**
**لـێم سوورە،**
**پێت بزانن،**
**لە دەریاییێکی فریودا**

## دەتخنکـێنن!

**٢**

**زەنگ زڕاوە؛**
**دنیای کۆیلەیان هەژیوە*؛**
**مقۆمقۆ* داکەوتووە:**
**«بیسووتێنن!»**
**«بەزیندوویی پێستی بگوروون*!»**
**«جن جنی کەن!»**
**«لەکێ دەچێ ئەم بێ فەڕە؟**
**بێت و ئائمە خۆی داڕێـژێ*،**
**کێ دەوێرێ بڵێ من هەم؟»**

**کۆیلەی ترسەنۆکی خوێـڕی،**
**چ تاجدار چ تەپلە* لە سەر،**
**چ لە بەرگی رۆحانیدا چ زرێی* شەڕ،**
**وەکوو پۆلە چۆلەکەیێک**
**کە سێبەری واشەیان بەسەر کشابێ،**
**دڵەکوتێ و گەندەئارەق و جیقەجیق؛**
**پەشۆکاو و پشووسوارن.**

چەکی کۆنەی کۆیلەتیان هەڵکێشاوە؛
پان دەبنەوە،
کوڕنووش دەبەن.
سەدان دەهۆڵ و زوڕنایان هەڵگرتووە،
هەڵدەپەڕن؛
خول دەخۆن و دەورە دەکەن و
دەیژەنن.
سەگ خاوەنی خۆی ناناسێ*!
بە سەد زمان
بەسەر باڵای‌دا هەڵدەڵێن.
پێش‌بڕکێ و شانەچرکێیە؛
هێندێ کاڵ و هێندێ لێزان؛
کەس مافی خۆی بۆ دیتران جێ ناهێڵێ.

کاروانێ دێ.
پاڵەوانی سەربەدەرەوەی لەگەڵن.
خەڵاتی ئەفرا ـ سیاویان بۆ هێناوە.
نامەیەکە پڕپڕە لە جامەلووسکێ* و لاڵانەوە*؛
وەعدە و بەڵێن:
«هەر کەیکاووسم بۆ ڕام کە،
کارت نەبێ.

**خۆم دەزانم چۆن پاداشتت بدەمەوە.**
**لەم ڕۆکەوە**
**تۆ پادشایت و من پێشکارت!»**
**ئەمری کردووە بە فەرماندەرانی لەشکر:**
**«هەر مەیەڵن لە ڕاستەقینەکە بگا،**
**کار تەواوە!»**

**کاووس هۆشی لە لا نیە.**
**کەف دەچێنێ* و دەنەڕێنێ.**
**جەنگوز* و شەڕ هەڵگرسێن و**
**پەرێشانە.**

**چی ڕووی داوە؟**
**بۆچی دوو کۆڵەکەی جیهان،**
**تەختی شای ئـێران و تووران،**
**لەسەر جێگەی خۆی خزاوە؟**
**هەرەپیاوۆ!**
**لە دەریایەکی فریودا**
**دەتخنکـێنن!**

٣

دوو لەشکر بەرانبەری یەک
ڕیزیان بەستووە و ڕاوێستاون.
بەڕواڵەت دژی یەکن و بۆ شەڕ هاتوون
بەڵام یەکڕان* و یەکدڵن.
بەبێ ڕاوپرس*، بەبێ دووان،
هەر بە پەیڕەوی سروشتی کۆیلایەتی
لەسەر ئامانجێک پێکهاتوون؛
بۆ مەبەستێک لێبڕاون.
چی بە هوومان سپێردراوە،
هوجیریش هەر ئەوە دەڵێ.
چی لە ئەفراسیاو قەوماوە،
کاووسیش ئەوە دەبینێ:
«هەر مەیەڵن لە ڕاستەقینەکە بگا،
کار تەواوە!»

نیگایان دەکەن بە مار و
کونا و کون لێی دەشارنەوە.
ڕوخساریان کولۆیێک ژەهرە و
لە شەکری بزەی وەردەدەن.

مشقەمشق* و سیمڕ سیمڕ*
لە پەنای یەکتر دەخزێن و
چاو لە یەکتر دادە ـ گرن و
برۆیان هەڵدەتەکـێنن،
یانی: «نەکەی
شتێ بدەی بە دەستیەوە!»
چپە و سرتە:
«بەندی ئەم شێرە سەرکەشە
هەر تەنیا ئەم نهێنیەیە*.
بێت و خۆی لە
ئاڵقەی کەمەندی ئەم ڕازە
دەرباز بکا،
هاوارە لە ئـێمەی کوڵۆڵ! ...»
هەرە پیاوۆ!
سەد مخابەند* بۆ باڵای تۆ!
لووتکەی هەوارگەی زەمەندی*
گومانی تۆ
هەتا زەلکاوی مەییوی*
ڕاستەقینەی ئەم کۆیلانە
مەودای* دووری ژین و مەرگە!

**دەغیلت بم،**
**بە ئەسپایی پێ هەڵگرە،**
**هێشتا لاوی!**
**ئێرە - گیانە - گۆگەڕۆکی کۆیلەیانە!**



**«زەوی دمەڵــێکی* مۆرە*،**
**تازە ئاودزی کردووە*.**
**دەشتێ بایەقوش* دەخوێنێ و**
**هەر دڵی من**
**بولبولــێکە، بێوادە گڕووی گرتووە.**
**لە بن هەر بەردێ چەقەڵێ هەڵتووتاوە* و**
**قەپۆزی* دەلێسێتەوە.**
**ئەم چراخانە لە دەوری**
**ئەم تەختە ڕازاوە بۆچی**
**هێندە سڕە؟**
**ئەم شەرابە پاڵاوتەیە**
**بۆچی تامی ئاوی کوولەکە دەبەخشێ؟**
**پێکەنینی هوومان و بارمان لەبەر چی**
**لە بزەی قە ـ برکەن دەچێ؟**
**دەبێ شتێ ناتەواو بێ.**

دەبێ هوجیر درۆ بکا .
چۆنە ڕۆستەم نەهاتووە؟
باوەڕ بەم قسەیە ناکەم.
ئەو پاڵەوانە چینیە وا هوجیر دەڵێ ،
بە نــێونیشانی دایکمدا
خۆیەتی ... بەڵێ، ڕۆستەمە!

توێکڵی هەموو ڕەگەکانم
دەڵێی لوولەییێکی مسە.
بۆچی خوێنم وا سەنگین دەگەڕێ؟
دڵم بێعەجمان* هاواری
ڕۆستەم دەکا.
ئەم کۆیلە نامۆیانە* چەند
شووم دەنووێنن!
بۆرەپیاوی* ئەم دوو بەرە
چەندە شێوەی یەکتر دەدەن!
تینووی خوێنم!
ڕۆژ بێتەوە، ئابەم شیرەم
ئەستۆیان دادەگرسێنم* ؛
با ئەوندە تاریک نەبن!

وەختە شێت بم! ...»



سروشتت ئاوێتەیێکە
لە شیلەی تفتی* زەوین و
کاکۆڵی زەردباوی* هەتاو.
چەپۆکانی ڕەوەیەک ئەسپی سپی تۆڕ*
لە ڕێگا ڕۆیشتنتا دیارە و
زایەڵەی* هەزاران کانی
لە بزاوتدا* زنە دەکا*.
شەونمی سەوزەی کوێستانت
لێ دەچۆڕێ.
دیدارت چەندە ئاستەمە!
میچی گومبەزی کۆترخان لەگەڵتایە و
دیواری بێدرۆی قەفەس بەدەستەوە.
ئاسمانی تەسک*
یەکپارچە دەکەی بە قوڕقوشم*.
دڵی بینەر مەلـێکی ئێ ـ سک باریکە،
دەیدەیتە بەر دوو گاشەبەرد*.
لەبەر تیشکی جادوویی دیداری تۆدا
چی کانزایە* دەتووێتەوە و

چی خەوشە دەکەوێتە سەر.
لە قوولایی ناخی* کۆیلەیان هەڵدەستێ
هاواری سەختی جاڕز بوون*
لە بەشی بەسەردابڕاو.
نیگات پەیکەری نازداران
دەکا بە زێڕ.
لە بەردەمتا
دڵی گراوی* سەوداسەر*
لە کوڕەحەیران* دەتۆرێ و
گڕی ئاوات
یادی ئەوین یەکجار دەکا بە خۆڵەمێش .
بە کێت کوتووە کە دەرکەوتی
مەچەکی پاڵەوانانی لەشکرشکێن
بادا و بینووشتێنێتەوە؟
کێت لەگەڵە وا تووس و گیو بە دی ـ تنت
تەریقی* لە دەست و باسکیان دەکێ ـ شن و
لە زەینی پەشۆکاویاندا
بۆ حەشارگەیێک دەگەڕێن؟
دەغیلت بم،
ئەمانە چاوی مروون تێت دەڕوانن

یان بزمارن و بە جەرگتدا دادەکوترێن؟
نیگای کۆیلەیان لە حاست تۆ
بۆچی ئەوندە چڵکنە؟
کات لە گەڕان ماندوو دەبێ و
کوێرەماری ئەم گۆلکاوە لی ـ خنانە*
لە هەڕەشەی ئەندامی تۆ
ماندوو نابن!
ووریا بە کۆ*
لەو چاوە جوانانەت نەدا!
ئاوا بێپارێز* مەگەڕێ؛
ئێرە - گیانە - گۆگەڕۆکی کۆیلەیانە!
لێم سوور سوورە،
لە نێو دەریاییێکی خوێندا
دەتخنکێنن!

٤
بە سواری دێ؛
نێزە بە شان.
ڕاست هەر دەڵێی پەیکەرێکە و
سەرپاک لە نەبەردی* پەتی

دارێژراوە.
ئەسپە ئەمە لە ژێری‌دا
یان ئا ـ سنە؟
پڵینگانی نا ـ دیاری هەموو سروشت
نوقمی تۆقین و مەترسی
مەڵاز* دەبن و دێنە سەر چنگ،
کێو وەکوو لەنگەر دەنووێنن.
دەشت مەیدانچەیەکی تەسکە،
چی دی بە بەرەوە نیە.
نێزەکەی ڕاست دەکاتەوە و
ئەسپەکەی دێتە سەر پاشوو و؛
وەک بروسکە دەشریخێنێ و
داوای هاونەبەردێ* دەکا.
کێ دەوێرێ تــێی بڕوانێ!
کات لە جێی خۆی راوێستاوە.
پاڵەوانان یەکجار مێشکیان داتەکیوە*.
یەک لەسەر یەک
کاووس‌شا نــێوبردە دەکا* و
پاشان وەک شێر
دەنــێتە نــێو ڕەوەی سپا.

سپا ڕانی گورگ لێداوە؛
پەرمم پەرمم* و بەلەسە*.
جەنگاوەری لەتە قەڵغانێکی* کۆنە،
کەس نازانێ لە کەنگێوە
لەو سووچی دەشتە کەوتووە.
سەربزێوی* و مەیدانداری
نەخشی جاجمی تاوبردووە.
هاوار دەبەن بۆ ڕۆستەم و
پاڵەوانان تێدەووروووکێن
ڕەخش زین دەکەن.
ڕۆستەم واقی ووڕ دەمێنێ*:
«کەسێک و ئەم قیامەتە؟
ئەمە کاری ئەهریمەنە!»
دەردەکەوێ
بە خۆی و بەبری بەیان* و
ڕەخش و گورزی گاسەرەوە*.
دەریای پڕجۆش لەنگەر دەگرێ* و
لەشکرگا دەحەسێتەوە.

«سەری زۆر دێوی مەزنم

بە گۆپاڵ پان کردووەتەوە.
چیها شێر و پڵنگم دوولەت کردووە!
کۆپەی* گەلێ فیلی تۆڕم*
لە خۆڵی مەیدان وەرداوە.
ڕووم لە شەڕێ نەکردووە،
بە سەربەرزی نەیێمەوە.
بۆنی شیرت لە زاری دێ*؛
ئەجەلە هەڵتی گرتووە*!»

«ئوهۆ پیرە!
چەندی بڵێی فیلەتەن* و کەڵەگەتی.
پشتوێنە باریک و سینگ‌پانی؛
شێوەشێری.
پاڵەوانێکی بە ـ شکۆی
مەیدان دیوی.
بەڵام ڕۆژگار سواندووتی؛
بە یەکجاری تێک‌تەپیوی*.
لەبەر زەبرم دەبێ ڕاکەی؛
بەشی مشتێکی من ناکەی!»

بەم جۆرە دنیای کۆیلەیان
ڕۆستەمیان ناردە مەیدانت.
پیاوی پیاوان،
ڕۆستەمی جیهان پاڵەوان،
هەرە پیاوێ
کە وەکوو قاف*
دەڕوانێ بە سەر جیهانی کۆیلەیان دا.
هەرەپیاوێ
کە گونجاوە لە دنیای بۆرەپیاوان دا.

لێکدان لافاوی ئاستەمە.
ئەسپ و سواران دێنە سەما.
چەکی پیاوەتی دەکێشرێ،
گورز و شیر و تیر و نێزە
هەموو پڕزۆڵ پڕزۆڵ* دەبن.
کار دەگا بە چەرمی پشتوێن؛
دوو لەتە کێون لە ئاسن.
کێو دەبزوێ و دەستی یەکیان
ئەوی دی لەسەر خوانی زین*
نابزوێنێ ...
ئەسپ و سواران

لە خۆڵ و ئارەقدا گومن.
جارِز دەبن*؛
یەک لەیەکتر دەبە ـ زن و
ڕوو وەردەگێڕن بەرەو دەشت.
د ـ ڕێــژایی ڕۆژ وەکوو مۆم
لە مۆمدانی خۆڕاگری حەریفاندا
دەتوێــتەوە و
تاریکی نــێوجێیی دەکا*؛
نەبەرد بێ ئەنجام دەمێنێ.

نە دێوی سپیە، نە شێرە،
نە هەژدیها و جادووگەرە،
ڕاستەقینەیێکی تاڵە و
پێوانەی پیاوەتی ڕۆستەم.
پیاوی پیاوان،
جیهان پاڵەوانی مەزن،
یەکەم جارە
نێوی خۆی لە حەریفەکەی شاردووەتەوە.
مەستی و دڵنیایی حەریف
نەشتەرێکە کە لە جەرگی ئەو ڕۆدەچێ.

یەکەم جارە
وا لێوبەبار و ڕەنگزەردە؛
شەکەت و مات و جاڕزە*.
وەسێت دەکا و
زەوارە دڵداری دەدا و
لە دوای شێو سەر دەنێتەوە*.

لەشکر کۆیە وەکوو بۆڵێ تریێ ڕەشە؛
بڵاوە وەک ج ـ ریوەی ووردەئەستێرەی
ئاسمانی ساماڵی* بێ مانگ.
هەرکەس لە جێگەی خۆیەوە
قڕوقەپی* لێ کردووە و
لە قووڵایی تاریکیدا
بیرەوەری کفن و دفن
بۆ خۆی دەورە دەکاتەوە.
ئاسمان و زەوی گزیرن*،
لە کەوشکەنی بەزمی شەرابی سۆرابدا
دانیشتوون و مشەیان لە خۆ بڕیوە،
چاوەڕێی فەرمانی ئەون.

٥

ڕۆژ کورتەنێزە هەڵداوێ و
سینگی ئاسۆ هەڵدە ـ دڕێ.
خوێن بەرەو ئاسمان هەڵدەچێ.
ڕۆستەم بە بەرگی شەڕەوە
ڕوو دەکاتەوە لەمەیدان.
ڕەنگی مردوو لەسەر ڕوخساری نیش ـ تووە و
مەودای نیگای
بە ئەندازەی درێژی نێزەکەیەتی.
پیاوی پیاوان،
جیهان پاڵەوانی مەزن،
هەرەپیاوی شکان نەدیو،
یەکەم جارە پیاوەتی خۆی
بەم چەشنە لە
بۆتەی* مەترسی شکاندا بەدی دەکا،
بۆتەی مە ـ رگ!

«ئوهۆ پیرە!
بەڵـێنی دوێنێمان لەسەر زۆران بووە.
پاڵەوانێکی بەفەڕی*،
بەڵام ڕۆژت بەسەرچووە*.

بەزەییم دێ بەباڵاتدا؛
بچۆ لەسەر جێگە بمرە،
با نەبی بە
خۆراکی دڕندەیانی ئەم شەڕگەیە.
دڵم لێدەدا* ڕۆستەم بی،
واش نەبێ هەر
دەبێ لە بەرەی نەیرەم بی.
دەست لەم بەدخووییە هەڵگرە.
کۆتا کە ئەم دڵڕە ـ ق ـ یە.
وەرە بەزمی ساز و مەیێ پێکبهێنین.
یەک دوو جامێ بە شادی یەک بخۆینەوە و
خەوش و کینە بشۆین لە دڵ.»

«دوێنێ باسمان لە زۆران بوو
نەک ساز و مەی.
گەزەم مەدە*، خۆ منداڵ نیم.
ئەگەر کەیفت لە شەڕ نیە بیدرکێنە،
با لات بۆ شل کەم* تا ڕاکەی.»

ئەسپان دوور دەبەس ـ تنەوە و

داوێنی زرێ* هەڵدەکەن.
زۆران ڕەوەی کەڵەکێوی پەشۆکاوە؛
تێک ئاڵاون، گـێژ دەخۆن و ڕێ دەرناکەن.
ڕۆستەم تا چاو دەکاتەوە
تەختی پشتی نرکە لە زەویەوە دێنێ.
بلووری ئاسمان خڕەی کرد
یان تەبەقی* زەوی بوو کە هەڵگەڕاوە؟!
پۆلێ کەوی ئەساتیری
قریوەی کرد و هەڵکشا
بەرەو سووچە نامۆکانی
گەردوونی* بێ سنووری بەرز.
«تەقەی چی بوو، سەرمی لێکەوت؟
نەمزانیبوو ئەم جیهانەش میچی هەیە!
دێوی سپی و ئەو فیل و شێر و هەژدیها و
ئەو هەموو هاونەبەردە بەدەستەڵاتە
بۆ تا ئێستا خۆیان پێ نەناساندبووم؟
خۆزگە دەکرا
جارێکی دی لە مەیداندا دەمدینەوە و
پڕ بە دڵ ڕێزم دەگرتن!»
تەنیا لە چاو لێکنانێکدا،

بەڵێ ڕاست هەر تەنیا لە چاو لێکنانێکدا ،
لە نێوانی ئاسمان و زەویدا ڕوویدا ،
دەرکەو ـ تنی
سنووری ئەم جیهانە بەرتەسکە* دەڵێم ،
هەست کردنی تاریکی نامۆ
لە پشت موحیتی نوورەوە.
هەر تەنیا چاو لێکنانێک بوو؛
ماوەی بیرکردنەوە نەبوو؛
دەستی زاڵ و بێخەم و ئاسوودەی حەریف
خنجێری خۆی هەڵکێشابوو.
ماوەی بیرکردنەوە نەبوو؛
ئەگەر ماوەی بیرکر ـ دنەوە ببوایە ...
بەڵام ئێستا ماوەی بیرکردنەوە نەبوو.
تەنیا لە چاو لێکنانێکدا
هەرچی شێعر و گۆرانی بوو
بۆ ئەبەد خامۆشی پێهات.
بە خۆدا هەڵگوتنی بەرزی مەیدانی شەڕ
بوو بە خۆ هەڵکێشانێکی* بێز لێ کراو.
قەد و باڵای تەهمینە و گشت
نازدارانی سەر ڕووی زەوی
بوو بە پەیکەری گڵینی گۆشەشکاو.

**جیهانی نوور و ئەستێرە**
**بوو بە چواردیوارێکی قوڕ.**
**بەزمی شەراب و مووسیقا**
**جێی خۆی دا بە سفرەی چە ـ ور.**
**بازی سپی ئالوودەی سەیرانی هەوران**
**لە تەپۆڵــکەیەک* نیشتەوە.**
**پیاوی پیاوان،**
**جیهان پاڵەوانی مەزن،**
**هەرەپیاوی شکان نەدیو،**
**ڕۆستەمی زاڵ،**
**بۆ هەمیشە هات بە چۆکدا و**
**سەری داخست.**
**تەنیا لە چاو لێکنانێکدا**
**بە کوێرەڕێی سەدان ساڵەی**
**دەرونی خۆیدا داگەڕا و**
**لە نێو قاڵبێکی تازەدا**
**خۆی دۆزیەوە.**
**خۆی دۆزیەوە و چەکی کۆیلەتی هەڵکێشا و**
**خۆی دەرباز کرد!**

هوومان غار دەدا و دەیگاتێ:
«چ بوو؟ چت کرد؟ ...
چت بە خۆت کرد! ...»
نیگای هوومان
ئەنجامی نەبەردی دوایی دەنەخشێنێ.
بەداخێکەوە مات دەبێ و
لێدەدا دەگەڕێتەوە.
هەر ئەوساتە یەکجار دەستی لێ دادەشوا* ...

هەرەپیاوۆ!
لووتکەی هەوارگەی زەمەندی
گومانی تۆ
هەتا زەلکاوی مەییوی
ڕاستەقینەی ئەم کۆیلانە،
مەودای دووری ژین و مەرگ بوو.
لێم سوور سوور بوو،
چەکی گڵاوی کۆیلەتی
باڵی هەڵۆی بەرزی پیاوەتیت دەشکێنێ ...

٦
تۆفان هێور* بووەتەوە.

بڵێسەکان* دادەمرکێن.
مار و مێروو سەر دەردێنن.
ترسەنۆکان
بە پارێز* و بێ باوەڕی
لە بەری ئاسمان دەڕوانن.
دەشتی تاساو پشوو دەدا و
لە لەززەتی بێدەنگی‌دا پەل هەڵدەخا*.
لەسەر بەستێنی بەرینی* بێ بزاوی
دەنگی بانگ و ڕۆ هەڵدەستێ و
تا دێ گەورە دەبێتەوە.
ئاهەنگێکە* و بەرپا دەبێ؛
قوڕپێوان و شینگێڕیە.
کۆیلە تەرمی پیاوانیان چەندە خۆش دەوێ!
بەڵێ، کۆیلە
تەرمی پیاوانیان خۆش دەوێ و
کاتی مەرگیان
لە ناخەوە شیوەن دەکەن؛
لە ناخەوە!
بنێرە شوێن پاڵەوانان.
بە تووس و گیو بڵێ با بێن.

بڵێ پۆلە هەڵۆی توورە
لە یەکیەکی ئەندامی ئەو کۆچیان کردووە.
بڵێ ئەو ئەسپە بێ ئۆقرە یاڵ پەخشانەی
کە چەپۆکیان لە هەور دەدا،
ماندوو و مەلوول
هەموو لووتیان داژەندووە*.
بڵێ پێ بە جەرگی خۆتاندا بنێن* و
وەرن چاک لە نزیکەوە
تێی بڕوانن،
بەشکوو نەختێ غیرەت بێتەوە بەر دڵتان؛
با بۆ هەمیشە نەدۆڕێن!

مەرگێکی قورس
لەسەر سینگی پەپۆکەی خواردووە*.
ژەهری توندی مەرگ و تەنیایی و بێکەسی
تێی ئاڵاوە و
لە گێژاوێکی* بێ بندا نوقمی کردووە.
لێڵاوی ناڵەی بێگانەی
ئەم شێوەڕۆستەمە لە کوێ
دەتوانێ دڕ* بەم دەریای غوربەتە بدا؟
هەنیسکی* گەرمی شینگێڕێ

نیه، ساتێ
ئەو لۆ لۆ پەردە نادیارە
سارد و سڕانە لابدا
کە بەری هەوای گرتووە و
نایەڵێ دەست و دەنگ و سۆز
بگا بە پەیکەری سۆراب.
نیە دەستێ - هاوارەکەم! -
بڵاوە بکا بە قاڵمەی*
ئەم شینگێڕانە کە دەنگیان
شەپۆلی کای نێو چەرخی گێژەڵووکەیە!
گریانی ئەم شینگێرە دوورەدڵانە
گڕی خۆیی* مۆمێ نیە،
بڕەوێنێ ئەو تاریکیە زا ـ ڵمانەی
چینچین لە دەوری تەرمەکەی ڕۆدەنیشن.
شنەیەکی ئازاد نیە، بشەکێنێ
ئەو گەڵاسەوزانەی مەیلەو هەڵوەرینن.
ئەم گابۆڕە
خورووی قەتماغە بەس ـ تنی*
چاوانەی برینی* پیسە؛
ئاسوودەیی هەڵکڕاندنی* لووی* نەگریسە*.

**هاوارەکەم!**
**ئەم دەشتی دۆزەخە خنکا**
**لە غوبار و لە گەرمادا؛**
**ئای بۆ ڕێـژنە بارانێکی هەمیشەیی**
**خۆش بباریّ و**
**نەهێڵیّ سیس بیّ ئەم سەروە**
**کە ڕەشەبای ناوادە باڵای خستووە!**
**من سەرسووڕم*،**
**ئەگەر باووشی بیّ ڕیای سروشت نەبیّ،**
**هەرەپیاویّ**
**کیّ دیّ بیلاوێنێتەوە؟**
**فریشتەییێکی بەهێز ئاواتمە**
**ئەم پەیکەرە بە ـ شکۆیە**
**لەگەڵ خۆی هەڵگریّ و بیبا**
**هەتا چەشنی ئەو لووتکانەی**
**کە بۆ کێوبڕان* دەست نادەن**
**لە هەور و مژدا گوم دەبیّ.**
**تابووتی ساجی* بۆچیە؟**
**ئەمە بەزمی بەدەعیەی* شایانەیە یان**
**شینگێڕیە؟!**
**موشک و عەنبەر مەکەن بەسەر**

ئەو گۆنا ناسک و گەشەیدا
دەیشەمزێنێ!
سووراوەکەی ڕەنگی مسی لێ نیشتووە.
لێوەکانی وەکوو ڕۆژان
پاراو و گەش نانوێنن.
بزەی مەستی و دڵنیاییان لەسەر نیە.
مەگەر شەکەتی نەبەردە*؟
مەگەر حەریف
تاوێ زیاتر خۆی ڕاگرتووە؟...

دلێرۆ! لاوۆ! غەریبۆ!
چەندە سەخت و جە ـ رگبڕە
کە کۆیلەیان
گەورەیی تۆ
لە پشت چەند پەردەی نادیاری
بێ هەستیەوە
لە تەرمەکەتدا ڕێزدەگرن!
هەرەپیاوۆ!
تۆ لە دڵی زەوینەوە هەڵتدابوو*.
ئا ـ سمان بە جریوەی کاکێشانەوە*

لە سەرتا بوو.
چ خۆیی* بووی
لەگەڵ زایەڵەی چۆماوان!
کەشم و نەشمی*
شنەبات چەند جوان هەستدەکرد!
خۆشەویست و نازداری گەورەیی تۆ بوون
ئەو تۆوانەی کە لە دڵی گەرمی خاکدا
بە بێخەمی
چەکەرەیان* دەکرد و پەلیاندەهاویشت.
قاپووڕی* ووشک
بە هەیبەتی نێوت دەشکان.
لە ئارامی و ئاسایشتی بوونی تۆدا
بەهار وەچی دەردەکرد و
زریان هەژگڵی* پاییزی ڕاپێچ دەدا.
د ـ رێـژی ساڵت لە بەینی
باران و تاو و شەختەدا
دادگەرانە دابەش دەکرد.
لووتکەت بۆ هەڵۆ دەویست و
شیوەڵە بۆ قەلەڕەشە؛
زەل بۆ بۆق و
بێشە بۆ شێر!...

**چەندە زولاڵ و ڕۆحسووک بووی**
**لەگەڵ کۆمەڵی کۆیلەیان؛**
**کۆیلەیان چەند پڕخەوش و دڵ رەق لەگەڵ تۆ!**
**ئـێرە - گیانە - گۆگەڕۆکی کۆیلەیانە؛**
**لەکوێ هەرەپیاوی وەک تۆ**
**لەم جیهانەدا دەگونجا؟ ...**

**٧**

**بەم جۆرە زە لی کۆیلەیان**
**خۆی ڕزگار کرد**
**لە تۆفانی بەری چیا.**
**بێشە دراوە بە چەقەڵ؛**
**لووتکەی هەور بە قەلەڕەشە.**
**ڕۆستەمی زاڵ،**
**هەرەپیاوی گونجاو لە نێو بۆرە*یاندا،**
**نیوەی پیاو و نیوەی کۆیلە،**
**لەم نەبەرد*ەشیدا سەرکەوت.**
**هەرەپیاوۆ!**
**لووتکەی کوێستانی زەمەندی ئامانجی تۆ**

هەتا زەلکاوی مەییوی
ژیانی ئەم کۆیلەیانە
مەودای دووری ژین و مەرگ بوو!
ئەتۆ لف* بووی لەگەڵ مەرگ و
سەرئەنجام لەپاڵ مە ـ رگدا
حەسایتەوە.
بۆ هەمیشە ڕزگاریت هات
لە ئازاری ئەو کۆیلە چاوچڵکنانەی*
بە دی ـ تنت
دەبوون بە تۆپەنەوتینەی گڕتێ بەربوو و
خۆیان دەدا بە باڵات دا.
ڕزگار بوویت و حەسایتەوە!
ئارام بگرە! بنوو*! شاد بە!
جیاوازی چیە یەک دوو ڕۆژ
زووتر بێ یان خۆ درەنگتر؟![۲]

گەلاوێژی ۱۳۷۵
تاران ، سنە ، بۆکان

---

[١] کەسێکی کە چیرۆکی رۆستەم و سۆرابی نەبیستبێ، لەم شێعرە ناگا. تکایە ئەوەڵ کورتەی ئەم چیرۆکە لە فەرهەنگۆگ دا، لە ژێر ووشەی سۆرابدا، بخوێننەوە؛ پاشان وەرنەوە سەر شێعرەکە.
[٢] ئەم شێعرە پێشتر لە گۆواری "ئاوێنە" ، ژمارەی ٤٨-٤٥ ، ساڵی ١٣٧٨، لاپەڕەی ٦٦-٦٠ دا چاپ کراوە.

## *«لێت گەڕام و نەمدیتیەوە»*

چ تەلیسمێکی؟ چ ڕازێ؟
گیانی پاکی یان فریشتەی؟
خەونی، خەیاڵی، گومانی،
یان شێعری ڕووت؟
شاژنی* قەڵای ئەفسانەی
یان کچی پادشای زەریاکان؟
لــێتگەڕام و نەمدیتیەوە.

لە ڕوخساری چەندها کەسدا بەدیم کردی!
لە چەند جێگەی ئاستەمدا شوێنم هەڵگرتی!
چەندها شەو و ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵان،
چەندها جاران،
بە دەردی ئەوینی تۆوە
هەڵچۆقام* و تلامەوە؛
کەچی پاشان تێگە- یشتم کە تۆ نەبوویت!
لە بوونی گشت ئەم ئەوینە شێــتانەدا
لە تۆ گەڕام.
لــێتگەڕام و نەمدیتیەوە!

من دەردی‌دڵـێکم هەیە،
لەگەڵ دڵی سەرگەردانم؛
کە پاییز هات،
چیە جیاوازی نـێوانی
گوڵەباخ و دڕکی تەنگز*؟
شاباز کە باڵی هەڵوەری،
با جێ پەنجەی بەسەر لووتکەی
سەدان چیای سەر بە تەمیشەوە مابێ،
لە مریشکی بەکڕ* دەچێ.
کام تاریکان
پشووگر و دڵتەنگ‌ترە
لە بەسەرهاتی ئەو سەروە شۆخ و شەنگەی
کە لە دەرەیەکی گوم بووی بێ ڕێبواردا
باڵا دەکات و هەڵدەچێ؟
بێ تۆیی چەندە ئاستەمە!
لـێتگەڕام و نەمدیتیەوە!

هەر غەمزەیەکت* لە چاوێ،
هەر نازێکت لە غەمزەی نازدارێک‌دایە.

لۆمەم دەکەن دەڵــێن عومری بە خەسار دا؛
نازدارەکەم! لۆمەم مەکە،
عومری خۆم بە خەسار نادەم،
دەتبینم و ناتبینمەوە!

سەختە ئەم ئەسپە سەرکەشە بێ هەوسارە
کە چەپۆک لە ئاسۆ دەدا،
لە پەرژینــێکدا بسرەوێ.
شابازی ڕۆژینی دڵم
ڕووی لە مەڵبەندی ئاواتە،
دوور دەبینم، تازە سەری
بۆ دانی ئەم خاکە دانەوێ.
من هەواڵــێکم گەرەکە کە تەواو بێ؛
کام تەواوە
تازە دڵی بەم شکەستەیە* داکەوێ؟
تەواوەکەم!
تەواوی عومری تەواویم
لــێت گەڕام و نەمدیتیەوە!

تۆ دەستکاری چ دەستێکی
ئەی گرێ پووچکەی* عومری من؟

تاسەی سەختی یان بەرزەفڕی نەبەجێ؟
سەزای ئیست و ئاوورڕ دانەوەی نـێو خولی
بێ ووچانی
یان تۆڵەی مل نەکردن بە
بەشی بێدادی گەردوون‌دا؟
ئاهۆی* نێو لانکەی ئەم شاخە
پڕخەمە سەر بەتەمانەیت
یان شوومی تەماحی خاوی
جەردەیانی لانکەدزی*؟
سەرئەنجامی عومری ناچاری غوربەتی
یان پەیوەندی
ڕیشەی سیس و ووشک و کزی؟
شێتی و خولیای جوان‌پەرستیت
یان تەقینەوە و هەڵچوونی
گڕکانی ژیان و شادیت؟
بێ دەستەڵاتی یەخسیریت
یان بیانوو و گڕووی ئازادیت؟
دە پێم بڵێ،
تۆ کێیت، تۆ چیت؟
لە تینووی تۆ

سیم ووـ شک بوو*، سوێم هاتەوە*.
نیوەگیانـێکم پێ ماوە،
خۆم نیشان دە،
با بیهێنم بەپاتەوە.

ئاسکۆڵەی چیمەنی ئاسمان!
عەتری جوانیەکانی زەوی!
بینایی چاوی مانگ و ڕۆژ!
پەیامی سریوەی* زەمان!
هانی* بوون و
پاسای* سەخڵەتی ڕابواردن!
پەڕ و باڵی خۆ دەر کردن
لە نشێوی هەناسەچن*!
تامی تاڵی دواهەمین کۆچ!
دەنگ دانەوەی ڕسکانی* گیان
لە قولینچکە نامۆکانی
پیرۆزەی* گەردوونی بێ بن!
مەنزڵــگات کام
هەوارگەی* نەدۆزراوەیە،
سا ئەی هاوار؟

خیز نەماوە لەم خاکەدا،
شەهێنی* نیگام نەیبــێژێ.
پەڕەسێــلکەیەکی س ـ رگ*
بەم ناوەدا ڕانەبووردووە،
پەنجەم خەوشی خۆی بە گرـ تنی نەڕێژێ*.
لووتکەیەکی دەستنەدەرم پێ شک نایێ،
مۆڵــگەی* جێ هێشتووی خۆم نەبێ.
لە پەلکە زێڕینەی سێحری
نیگای سەدتەرزی چاوان‌دا
خەتێ نیە کە نیگای من
واتا* و مەبەستی نەییَــژێ.
من سەدان جار
وەک هەڵۆیێکی بێ حەریف
بەسەر شنەی مێرگی دڵان‌دا گەڕاوم.
من سەدان جار
وەکوو شابازێکی لووتبەرز
بەسەر دەریایێ شەپۆلی نیگای سەوزدا
تێ پەڕیوم.
لە جەنگەڵە ئوستوورەییەکانی ئەولای
مەڵبەندی خۆشەویستی‌دا

ئەم چڵ  بۆ ئەو چڵ فڕیوم.
نەچیری تۆڕ!
لــێت دڕدۆنگم* خودی مەرگ بی؛
لە کونج بە کونجی جوانیدا
لــێت گەڕام و نەمدیتیەوە.

٧٥/١٠/١٤
سنە

## له کومه ڵه‌ی «خولیای بێناوی و فه‌رامۆشی»

(ئیجازه‌ی چاپ ١٣٨٦)

## له گه‌ڵ چه‌ند پارچه‌ی تازه

## «چوارخشتەکی»

بڕوانە قولینچک* بەشمە لە بەر ژانــی دڵــم
خەم سووک ئەبێ گەر بڕژێ ڕق و داخ و کوڵم
ئەفسووس کە لە بن گڵــە خەنیمـــی* دڵەکەم
ریشەی لە عەرزدایە، بەڵـــێ، دارەزوڵـــــم

پایزی ١٣٧٢
تاران

***«بەندێک لە شێعرێکی نەنووسراو»***

**قووڵ بوومەوە، قووڵ بوومەوە تا گەیشتمە سەر پشتی موتڵەق**

**پیاو بێپووڵ بێ، دایمە لە موتڵەق ئەگەڕێ.**
**موتڵەق نەبێ، هەڵئەخلیسکێ.**
**موتڵەق نەبێ، پشووی لە سینگی دەرنایێ.**

**پووشپەڕی ١٣٧٢**
**تاران**

## «سکاڵا ١»

پێشم سەگە،
پشتم سەگە،
تەنیشتی راستم هەر سەگە،
تەنیشتی چەپم هەر سەگە،
سەگ گەمارۆیان داداوم*،
وەختە بمخۆن.
تەنیای تەنیام
جارجارەیەک رۆحی باوکم لە گەڵمایە و
جارجار چاوم لە ئاویەرە*
وا بەینێکە
هاتوومەتە سەر باوەڕێک:
پێموایە کە
شاعیری ئەم وولاتە شێوە وێرانە
تاقە یەکی بەدەردی خۆی نەمردووە.

١٣٧٧/٢/٢٧
سنە

### «سکاڵا ۲»

**شاری کوڵۆڵ**
**گۆمێکه مه‌ند،**
**بۆمباکانی هیروشیما و ناکازاکی بخه ناوی،**
**نایبزوێنێ**
**ته‌رمی هه‌موو شه‌هیده‌کانی هه‌ڵه‌بجه‌ی تیا بشۆره،**
**شلوێ* نابێ.**
**ئاسمانێ ئه‌ستێره‌ی جوانه‌مه‌رگ**
**به‌سه‌ریا داببارێنه،**
**شه‌پۆل شه‌پۆلی ناگه‌زێ*.**
**که‌چی ته‌نیا به فسووله‌ی**
**مه‌له‌که‌رێکی پشووسوار**
**-به سکاڵای هه‌شیشیێک –**
**ئه‌شڵه‌قێ و قه‌ڵبه‌زه ئه‌کا*.**

۱۳۷۷/۲/۲۷
سنه

«سکاڵ ٣»

شاری کوڵۆڵ خنجێرێکە
خۆشدەس و دە ـ سک پڕ بەمشت
هەر کاتێ ئارەزوو بکەی
لە دەستایە.
بەڵام ئەفسووس
کە دەستت بۆ برد، تێئەگەی
دەسکەکەشی وەک دەمەکەی
بڕندەیە*.

ئیلهام ١٣٧٧/٢/٢٧
نووسین ١٣٧٩/١٠/٢٥
قەڵەندەر

*«سکاڵا ٤»*

**شاری کوڵۆڵ**
**گراوییێکە* ئامۆزای خۆت.**
**جوان نیە بەڵام دڵگرە.**
**دەلال* نیە و هەستبزوێنە.**
**خۆشت ئەوێ و ئەویندار نیت.**
**پێت خۆشە دووری لێ بکەی**
**بەڵام سۆزی ئەویندارێتی رابردوو و**
**غیرەتی کوردە نامووسی**
**لێت ناگەڕێ.**

**ئیلهام ١٣٧٧/٢/٢٧**
**نووسین ١٠/٢٥ /١٣٧٩**
**قەڵەندەر**

## «ژوانگە»

**لێرەکانە، لە شارەکەی گۆیژە و سەیوان،**
**لە شارەکەی مامەیارە و سلێمان پاشا،**
**بە ناسیاوی گۆران و پیرەمێردەوە رووم تێکردبوو،**
**شێخ مارف و کاک ئەحمەد و مەولانا خالیدم بینی.**
**لێرەکانە بە بۆنی بەر درگاکەی سەراوە هاتبووم،**
**باخەکەی حەسیب سالحم دۆزیەوە؛**
**خلوەتگەی ئونسی شەو و رۆژ،**
**بەهەشتی خونجیلەی زەوی.**
**لێرەکانە بە تەمای سەرچنار هاتبووم،**
**مزگەوتەکانی ئابلاخ و شێخ سەلام و**
**کاک ئەحمەد و هۆمەرەکوێر بوون بە ژوانگەم.**
**لێرەکانە بە ئاواتی بەهاری سەوزەوە هاتبووم،**
**نوقمی پایزێکی زێڕین بووم؛**
**وەرزێکی غەریبی تازە،**
**شەوانی درێژخایەنی پڕ راز و نیاز.**
**ئاخ لە بارانی ئەو شەوەی حەسیب سالح**
**رۆژم کردەوە لە ژێریا!**

مانای ڕەحمەتی لێکداوە بۆ دڵی پڕ کوڵ و دەردم.
لێرەکانە، لە شارەکەی مامەڕیشە،
بە هیوای کوردایەتی بووم،
مرۆوایەتی بوو کە هات بەرەوپیریم.
لە کوێرەرێیێک ئەگەڕام کورد رزگار کەم،
جادەی رزگاری مرۆویان پێنیشان دام.
لێرەکانە خۆم ئەکوتا بو ئەوەی کە تۆزکاڵێک بحەسێمەوە،
داوی بەسامی دەسەڵاتسپێنە جیهانخۆرەکان.
خەباتێکی ئاڵۆزتریان فێری من کرد.
لێرەکانە خەمی تەنیایی هەڕەشەی تێکشکاندنی لێ ئەکردم
ئەوینی تۆ گەیشتە فریام،
دۆستی خۆم، ئەی جوانی بێچوون!
تەواوتری گشت تەواوان!

رووت کراوم لێرەکانە،
ئا لەم ملەی جەردەیانە،
کۆ بە کۆ* و شەقام بە شەقام،
چیم هەیە بیکەم بە دیاری
جگەد لە گیانی خەستەی خۆم؟
دەس هەڵگرە لە کەم لوتفی،
گۆشەی نیگایێکم پێ بە.
غەری ـ بم و خەفەتبارم،

چاک نیه دڵم بشکێنی.
گەیشتوومەتە دەمەدەمی چل ساڵەیی،
دوندی بلووغ،
لەمەودوا بە تەمای چی بم؟
بێهوودە نەبوو نەدیدە بە خۆم ئەووت:
سلێمانی بەهەشتی سەر رووی زە ـ وییە.

١٩٩٩/١٢/١٧
سلێمانی، میوانخانەی ئاوات

## «مەنزڵ»

ئەوەتانێ!...
ئارمانجە بەرزەکەم ئەڵێم.
ئەوەی کەوا ساڵەهایە تامەزرۆیم.
لە ئاسمانی ساوی پڕ لە ئەستێرەیا،
لە خەرمانەی سەوزی مانگا،
لە چاوەشووشەییەکانی پەنجێرەکەو
چوارچێوە ئاسنینەکەیا،
لە تان و پۆی پەردە پەرۆیینەکەیا،
لە میچەکەی بانی سەرما،
لە دیوارەکانی دەورما،
لە گوڵۆپە نیۆنەکە و
ئاوێنەکە و جلەکانا،
لە تەختەکان و دۆشەکە و پەتوەکانا،
لە لەشی لاوە شەلەکەی هاوژوورمدا؛
حەیی و حازر!
نەک وەکوو ئەوەی لە مەو پێش من بۆی ئەچووم، شێوەی مەرگ با،
ژیانە، ژیانی پەتی؛

ژینی ئەزەلی و ئەبەدی.
چاوی بڕیوەتە چاوم
بە بێ نووچدان و بە بێ خەو.
ئارام بە ئەی دڵی کۆلیل!
ئەم کەمەندە پڕ قایمە و نیە پچڕانی.
ئەو دەردەکاروانەی ساڵها ئەمی ڕەتاند*،
ئەنجامی ئەم مەنزڵە بوو؛
خۆم ئەمزانی.

١٩٩٩/١٢/١٧
سلێمانی، میوانخانەی ئاوات

### «بەهەشت»

بڕوانە ئەو کۆترەباریکە قەشمەرە*
چۆن ئاسوودە و تێر و تەسەل
کایە ئەکا و ئەتریقێتەوە* بە بێخەم
لە سەر ئەو بانەی بەرانبەر
لەگەڵ جووتەکەی و لە ناو یار و هاوسەرەکانیدا،
بێئاگا و سەرخۆش و هێمن،
لە ناو دەریای ئاسایشتی بێسنوورا،
نوقمی لوتف و بەزەی بێخەوش!
تۆ ئەڵێی ئەو زینووترە یان ئەم دارتێلەی کارەبا
یان گیانی من؟
یان ئەو دیوار و گوێسوانە؟
یان ئەم شینیە بێغوبارەی ئاسمانەکە؟
یان زەردیە کاڵ و گەشەکەی ئەم خۆری دەمی بەیانە؟
یان ئەو دارە سەوز و زەرد و کەڵەگەت و کورتەبنانەی
تاک‌تاک و بە کۆڕ وێستاون
لە ناو خانووەکانی شارا
ئەو خانووانەی کە هەر کامیان
خۆی قەسرێکی پڕ لە ڕازە؟

-ئای لە نهێنی ژیانی ناو ئەم کۆشکە ڕازدارانە!-

لە بیرمە کاتێ مناڵ بووم،
بریسکەی کێوی ساماڵی* بەفر لە کازیوە و بوومەلێڵی
ئێوارانا
دڵمی تەژی* ئەکرد لە سام*؛
خورپە و سامێکی پڕشیرین
شیرینی خۆ دەرباز کردن لە قاـ ڵبی جەستەی وەڕەز؛
بەزاندنی ئەبەدی تەنیایی.

لە بیرمە کاتێ مناڵ بووم ،
جارجارەییێک
جریوەی پۆلە چۆلەکە لە سەر داران،
بە یەکا هاـ تن و گەشتی دەیان پەڕەسێلکەی تیژباڵ
لە ئاسمانی لای ئێوارەی ئاواییدا،
خەرمانەی مانگی ئاسمانی ساف و بێگەرد،
چۆڵی مەزراکان لە عەسری ڕۆژانی پایزی درەنگا،
گیزەی سەماوەرە زەردە خەڵووزیەکە و
هات و چۆی بە شەوقی دایکم لە بەیانی ڕۆژی جەژنا،
لەببەیک لەببەیکی ناو ریزی نوێژی جەژن و

ئەڵڵاه و ئەكبەر كرـ دنی سەر لاشەی دەیان قوربانی
لە مەیدانی بەر مزگەوتا ،
كاڕ و كووڕی مەڕی سەر پەچە* و زایەڵەی دەیان بێری
چرابەدەس ،
سەفەر كردن بۆ دێیەكەی ماڵی خاڵم و بۆ شارەكەی ماڵی
مامم ،
دەس پێكردنی ساڵی تازەی دەرس خوێن ـ دن و
وەرگرتنی كتێبی تازە ،
قریوەی* سەمای بەردەم بووك ،
بەزمی دەهۆل ژەنی گەڕۆك*
بە خۆیان و شانۆگەری بیبیجان* و ورچ و عەمتەریانەوە ،
ئەمانە و گەلێ شتیتر
پڕپڕ سەرخۆشیان ئەكردم.
بەڵام هیچیان وەک سەرخۆشی پڕنهێنی ئەم بەهەشتە
زەوی-نییە
بەردەوام و بێسنوور و جێگەی دڵنیاییم نەبوون.
ئەم مەس ـ تییە داگری* گشت ئەو سەرخۆشیە كاتیانەیە و
ئەكەوێتە ئەولای هەمووی ئەوانەوە.

١٩٩٩/١٢/٢٠

سلێمانی ، میوانخانەی ئاوات

## «گوم بوون»

شەو بە رەشانی ئەخەوم،
بەیانی چاو ئەکەمەوە بەفرە و بەفرە و بەفرە و بەـ فر.
شەقام بەفرە، کۆلان بەفرە، سەری بانەکان گشت بەفرە،
دەشت و کێو و بەرز و نەوی
ئەوەی کە بەر چاو ئەکەوێت، سپیە و سپی.
هەموو یەکرەن ـ گن و نادیار،
گومن و گومن و گومن و گومن.
هەتا چاوم هەتەر ئەکا*، یەکسا-نییە و یەکپارچەیی.
رەشانیەکانیش هەر سپین،
ئەوانیش بەر چاو ناکەون.
رێبوارەکان
به مێزەر و چەتر و بالتەو شاڵ گەردنەوە،
حاشا یەکێکیان ببینرێن.
ماشێنەکان بەو پرتەپرت و خزین و ئاگر و دووکەڵ
کردنەشەوە،
مەعازەللا* لە چاو نادەن.
تەنانەت قالاوەکانیش بەو هەموو رەشیەیانەوە

**بەو هەموو قارڕەوە**
**هەر وەکوو خانوو و گوێسوانە و**
**وەکوو دارتێل و درەخت و**
**وەکوو هەموو گیاندارێکی ئەو بەیانیە**
**سپیدیارن.**
**عاسمان شینە، سامالّ سامالّ**
**بەلّام ئەویش هەروا سپیە.**
**خۆشت سپیت، خۆشت گومی.**
**تا چەند چرکە، تا چەند دەقیقە، چەند سەعات،**
**تا نیوەڕۆ، تا ئێوارە،**
**لەوانەشە هەتا چەند رۆژ دوای ئەو رۆژە**
**هەروا گوم بی و هۆش نەیێتەوە بە بەرتا.**

**بەیانی بیست و پێنجەمی رەمەزان بوو،**
**لە دوای پارشێو بە چواردەوری خۆما ڕوانیم،**
**شەقامەکان، سەر سەربان و گوێسوانەکان**
**گشت دیوار و گشت پەنجێرە و گشت درەخت و دارتێلەکان**
**دەشت و دەر و شاخ و کێو و عەرز و عاسمان**
**ئەندام بە ئەندامی لەش و جل و بەرگ و پیلّاوی خۆم،**
**یەک بە یەکی ئەو رەشانەی تێئەپەڕین،**
**چۆلەکە و کۆترەباریکەی سەحەرخێز و**

کەڵەشێری سەڵاکەر و
پشیلەی دز و سەگی ووریا و
کوانووی رەشی ئاگری شەوانەی پاسەوان،
پاکی سپی بوون و گوم بوون.
یەکپارچە گوم، یەک دەریا گوم.
بەـ فر نەبوو بەڵام گوم بوون.
خۆشم گوم بووم.
سەرخۆش نەبووم، ئەغیار* ئەغیار،
لە دوندی هۆشیاری خۆما بووم،
کەچی گوم بووم.
گومی رۆژ و سات و کات نا
گومی بێسنوور، بێ هاوتا.

٢٠٠٠/١/٢
سلێمانی، بەردەرکی سەرا

## *«دەریای داگر»**

شەو بوو، شەوێکی تاریکی بێمانگ.
ئەزانی چ شەوێ ئەڵێم؟
شەوی بیست و حەوتەمی رەمەزان.
لە سلێمانی، لە پاڵ مەیدانی سەرادا
لە قولینچکێکا پیاسەم ئەکرد.
ریزێک چاخانە و چێشتخانە کراوە بوون؛
بێکارەبا و کارەبادار.
چوار پێنج تاکسی وێسابوون و
چەند فەقیر لە گۆشەی شەقام خەو-تبوون و
بە- ین بە- ین گۆشتبرژێن و قەیماخ فرۆش؛
لە پشت مەنقەڵ و مەجوعمە دانیش - تبوون؛
کاریان هەبوو و کاریان نەبوو؛
دەوران دەوری مەیدانەکە
دیوارەکان و تەنەکە و تابلۆکانی سەردرگانەی دووکانەکان
لە بەر نووری گڵۆپی ناو مەیدانەکە
برقیان ئەدا و سپی دیار بوون؛
سپی، سپی؛
ئیتر ئەولای دریایێکی بێسنووری تاریکی بوو،

**تاریکی و بەس؛**
**چەند جار ووتم: یا نوور! یا نوور!**
**ئەوسا روانیم؛ وولّات روون بوو.**
**ئەو تاریکیە بێسنوورەش روونی روون بوو،**
**رۆشنتر لە رۆشنایی ناو مەیدانەکە.**
**سپیتر لە سپییێتی ئەو سپێدەی کە**
**بەفر ئەباریێ و دنیا ئەگریێ و**
**هەموو شتێ لە سپییێتی یەکپارچەدا**
**بزڕ* ئەبێ و ئەتوێتەوە.**
**خۆشم روون بووم.**
**خۆشم سپی بووم و بزڕ**
**دوژمن! دوژمن!**
**ڕێگر! ڕێگر!**
**ئۆقرەم نەما و رووم کردە ناو چاخانەکان.**
**چاخانەیێکم هەڵ بژارد بێکارەبا.**
**پیاو کاتێ کە دەستی پڕە،**
**ئاساییە کە ترسی ڕێگر هەڵی بگرێ و بۆ پەنا و پەسیو* بگەڕێ.**
**مەجبوور کرام کە پاش ساڵێک**
**گۆشتی برژاو بدەم بە نەفس**

سێ شیش برژاوم داوا کرد:
شیشێ گۆشت و شیشێ چەوری و تەماتەیێک.
چەند جار ووتم: یا رەحمان! یا رەحمان!
چەند جار ووتم: یا رەززاق! یا رەززاق!
چەند جار ووتم: یا حەمید! یا حەمید!
گۆشت و دووگ و تەماتەکە
کەل و پەلی چاخانەکە و
سووچە تاریکەکانیشی
گشتی روون بوون، سپی، سپی.
سپی وەک شەوە زەنگەکە و وەکوو عاسمان،
وەکوو سیگارەکەی دەستم.
لەگەڵ خواردنی خواردنەکەما
ئەم سنووقەم لە کەرەسەی شێعر دارِشت و
چیم دەست کەوتبوو تیاما داشارد.
سنووقەکەم دانەخستبوو کە کارەبا پەیدا بووە و
شاخە شاخی تەلەفزیۆنی سەتەلایت
بێدەنگیەکەی پاک شڵەقاند.
چاخانەکە  وورده وورده
بەرەو قەرەبالغی ئەچوو و
منیش لەبەر رووناکایی ئەم ساتەدا
گەڕامەوە بەرەو رۆژگاری رابوردوو...

رۆژێکیان لە کەلاسێکا
لە زانستگەی ئازادی سنە،
هاوینی پێرارەکە بوو،
کە بە خوێنکارەکانم ووت:
ئەگەر راست بێ کە دۆستانی حەق تەعالا
لە نێعمەتی کەڕامات بەشدار بووبێتن
ئەوا شێعرەکانی حافز
یەکێکن لە کەڕاماتە مە ـ زنەکان...
یا نوور! یا نوور!
یا عەزیم! یا حەیی! یا قەییووم!
یا... یا عەلییی!

٢٠٠٠/١/٣
سلێمانی، بەردەرکی سەرا

*«دەریا» (شێعرێکی ناتەواو)*

**بەیانی کە دەرئەکەوم**
**ئەبینم کە گەردالی بەـ فر باریوە.**
**کزەی نەحتێ توورەی دوێ شەو**
**هەوالی ئەمەی پێدابووم.**
**لە کێوەکان**
**بەـ فر دەستی کەوتووەتە سەر رەشانیەوە و**
**لە ناو شارا**
**ئەونە نەبێ کە شەقامە قیرەتاو نەکراوەکانی**
**پڕ کردووە لە قوڕ و لیلاو**
**زۆر کەم دیارە.**
**پشتی دەسم لە گیرفانی کۆتەکەما**
**بە سەرماکە کزەکزیە و**
**دەسم خێرا خەریکە کە لە گۆ ئەچێ.**
**ماشێنەکان وەکوو ئەوەی کە سەرما پەشۆکانبێتنی**
**بێریعایەت و بە تاوتر لە رۆژانی هەواخۆشی**
**تێئەپەڕن و**
**قوڕ و چلپاو ئاڕاستەی دەور و بەر ئەکەن.**
**دلم وەکوو گ بەیانیێ لە حەولایە**

که خۆی ڕێک و پێک کا و زاڵ بێ.
به سەرماکه له چاو ڕۆژان زینووتره و
به بەفرەکه سەرخۆش‌تر و گەشکەتره*.
باڵەپرشێی ئەوەیەتی که بڕوا بۆ دەرەوەی شار؛
ئاخر ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوە،
ڕۆژی مەلە، ڕۆژی دەریا،
ڕۆژی هەست و شێعر و بڕوا،
ڕۆژی یاد و ڕۆژی زیکر و
ڕۆژی موناجات و دووعا.
لەشم هێشتا لەگەڵ سەرما و لەگەڵ ئەم عاسمانه گرژه و
لەگەڵ قوڕی کۆڵانەکانی دەوری شار
قسەی تەواو نەکردووه،
مەیلی لێیه و مەیلی لێ‌نیه.
سکم لەگەڵ دینارەکانی گیرفانما مشت و مڕیه؛
گۆشتی برژاو و کەباب گرانه و؛
شله و برنج و شیرینیش
لوقمەقازی و بامیه و زولوبیا و بیسکویت
له م ڕۆژانەدا خواردومه.
ئەمڕۆکه ڕۆژی خورمایه،
ڕۆژی وەرزش و چالاکیه،

رۆژی تین و تاو و گوڕە،
رۆژی لەش سووکی و توانایە.
لوتفی حەق فریام ئەکەوێ و
بێ ئەوەی زۆر وورد بمەوە و سێ و دوو بکەم*
خورما ئەکڕم.
کیلۆییێک بە سێ دینارە
چارەکێکی بە قورسەوە بە دیناریێ.
بەستوویەتی و دەنکەکانی بە ئاسان لێک ناکرێنەوە و
وەکوو جاران بەدەم رێوە لەشەقامەکانا بۆم ناخورێ،
تاقەتی لچ هەڵقورتاندن و خیسبوونەوە و زرتەزرتی
بێکارانی چاخانەکانیشم نیە،
بە دەم خورما خوارـ دنەوە ڕێی دەری شار ئەگرمە بەر:
تەنیایی و بێدەنگی و زستان.
هێدی، هێدی
دڵم بە سەر قورسی قوڕی کەوشەکانم و
کسپەکسپی* پەنجەی دەستم و
خواردنەکەما سەر ئەکەوێ و
تامەزرۆیی خۆی ئەسپێرێ
بە یەکڕەنگی و دڵئاوایی دەشتەکان و
بە ڕوانینێک
لە داوێنی کۆڕی هێمن و پڕهەیبەتی کێوەکانا

وەکوو قوتابییێکی تینوو دائەمرکێ.
ئیتر زۆری پێناچێ کە
بەشی خۆی لە هێمنایەتی و لە مەیین*،
دەریای مەییو*، دەریای مەییو،
وەرئەگرێت و
لەگەڵ دووکەڵی سێهەم و چوارەم جگەرە یەکجاری
کزەی دەستم لە گیرفانی کۆتەکەما
فەرامۆش ئەکا و پێویستی
بە دەشت و کێو و سەرما و بەفر
بە ئاسۆی مەییو وعاسمان
بە شار و شەقام و کۆڵان
نامێنێت و رزگار ئەبێ.
ئەوسا لەگەڵ جگەرە کێشان ئەگەڕێمەوە بۆ ناوشار...

٢٠٠٠/٢/-
سلێمانی

**«نوور»**

**مانگ تەواوە و ئاسمان بێگەرد**
**هەوا بوومەلێڵێکی زێوینی ماتە و**
**شنەیەکی پایزین ئەشنێ.**
**جیهان ڕەوزەیەکی گردی سێحراویە.**
**ئارام گرتن**
**پاراس ـ تنی ئامانەتێکە لە دڵما**
**کە بەندە بە بێئارامی نەپساوەوەی زمانمەوە و**
**فەرامۆشییێکی ڕۆ ـ شنی ڕزگاریدەر**
**ئەبەخشێ بە هەموو بوونم.**
**لە مەستی سەرسپاردەییا**
**تەنانەت ئەو چرا سروشتیەی کە جارجار**
**ئەمرم پێئەکەن هەڵی کەم و**
**ئەو شەهەنشا پڕهەیبەت و نوورانیانەش**
**کە هەتا ساتێک لەوە و بەر**
**بە زەلیلی**
**پەنام ئەبردە بەر درگای بارەگایان،**
**لە بوونما جێیان نەماوە و**
**ئازاری بێئەنواییم و**

هەڕەشەی دوژمنی خوێنڕێژ
کە لە بن گشت دار و بەرد و دەوەنێکی
چواردەورما خۆی مەڵاز داوە*،
پووشێک بایەخی نەماوە و
وەکوو قنگەلاشکی* دەم با
ڕێگای خاکینی چۆم تا دێ
بە ژێر پاما تێئەپەڕێ.
بەڵام مەنزڵ
نە ئاواییە و نە ئەنوایە* و
نە تێکشکاندنی دوژمنە،
گەیان ـ دنی ئامانەتە و
ئارام گرتنە بە بێ بێقەراری زمان.

١٣٧٩/٦/٢١
قەڵەندەر

## «ئایەتێک بۆ عالەمیان»

لێم ئەپرسی: «تۆ کێیت؟چۆنی؟»
سیزیف* چۆن بوو؟
-گەرچی سیزیف ئەفسانە بوو –
مایداس* چۆن بوو؟
- گەرچی مایداس ئەفسانە بوو –
سەگێ بگری
ئاڵقەیێکی جەواهێرکاری پڕنووری
لە مل کەیت و
بەرەڵڵای ناو سەگەلی کەی،
نووری گەوهەر سەگەل بێنێتە خورۆش و
بە کەڵپە و چنگ تی وورۆکێن،
ئەوە چۆنە؟
پلە گۆشتێ
بە حەوت چینی جەهەننما بڕواتە خوار
عەزابی هەر چینێکی کە تەواو کێشا،
بچێتە ناو چینێکی بەتەووژمتر*،

ئەو چۆنە؟
مەحکومێک بیت
مەرگتیان بە ژەهر
بڕیبێتەوە و لەباتی*
پیاڵەیەک ژەهر کە بە یەکجار
هەڵی دەیت و بیخۆیتەوە،
داتنێن چل ساڵ
قوم قوم لەو ژەهر بچەشی،
ئەوە چۆنە؟
منیش ئاوام
□
لە ناو کلێپەی* بێئارامیا لوول ئە-بم و
دژهاوارێک* لە ناخی دڵم هەڵ ئەسێ
کە: پەروەردگاری عالەم!
من سەر سووڕم*،
چ حیکمەتێ لە خیلقەتی منا هەیە؟
چاوی پیسی چڵکنانە
ئاخۆ کاری لێ کردووم و
ئاوا دنیای لێ تار* کردووم؟
سیحر و جادووی خوێریلکە و دێوسروشتانە
مەودای خۆشی لێ بڕیوم و

ئارام و ئۆقرەی لێ سەندووم؟
یان کەمەندی هیممەتی هیممەت بەرزێکە
وا چل ساڵە لە ملمایە و
دەرە بە دەرە و کۆ بە کۆ*
رام ئەکێشێ؟
بو کەسێ نیە پێم بڵێ
ئەم دەردە چۆن راڤە ئەکرێ*؟

سامان داران بە تێر کردنی
چاوی تەماحی چنۆکان
لە بەغیلیان رزگار ئەبن؛
سامانی من هەر هونەر بوو و هەر زانست بوو،
هەرگیز دەورەم نەدا بۆ خۆم،
هەرگیز لەرووی خوازیارێکا،
پیاو و ناپیاو،
دۆست و دوژمن،
چین و پەرژینم بۆ نەکرد
کەچی بەغیلی و حەسوودی
چاونەتێرانی بێنمەک*
وەک گورگی هار
هەمیشە بە دوامەوەیە و

دایمە کەڵپە چیڕەیەتی و
بەردەوام دەمی تێ ژەندووم*؛
ساتێ چیە هەدا نادا و مانوو نابێ و
دەس هەڵ ناگرێ.
کە ناوداری سپەری* فڕداو مەیدانی
بەربەرەکانێی* بە جێ هێشت،
ئەوەی خاوەن ئیددیعایە
دەسی لە کۆڵ ئەکاتەوە؛
من سەهلە کە ئیددیعام هەر نەناسیبوو،
لە دەریای سەسامی* سەختی
چارەنووسی تاڵی خۆما
بە بێهۆشی پەلم ئەکوتا
کە بێناوانی زەبوونی ڕێوی سفەت،
ئەوانەی کە هەر تەنیا بەزەبری کلکیان
ئێسکیان ئەشکاند*،
بە گەل بەرۆکیان پێ گرتم.
کە دەیرنشین تەرکی ئازاری غەیر ئەکا،
تەنانەت دڕندە و کێویش
تەرکی ئازاری ئەو ئەکەن؛
من ئەوندە بێئازار بووم

که خاوەن جەورانی تۆخی* دڕندەخووش
لە ئەشکەنجەی دڵ و ڕۆحم
دوودڵی لە گلێنەی* چاوەکانیانا
بریقەی ئەدا،
تەنانەت لە قۆناغ بە قۆناغی ژینما
دیومە لە گەلی بێبیانوو دوژمنانم
کە زەقە زەق چاویان بڕیوەتە چاوم و
ووتوویانە:
"دەبڕۆ ئیتر لەمەودا چۆنت پێخۆشە
ئاوا بژی و
مەبەست و مەڕامت چیە
خوامان ئەکرد پێیشی ئەگەیشتی،
ئێمە بەش بە حاڵی خۆمان
چی دەرد و بوغز
لە دڵمانا خڕ ببووەوە
بە زیرەکی و دۆزەخزمانی و مێمەکری* و
غەدرەئازاری* بێووچان
پێمان ڕشتی."
کەچی هەر ئەم دێوسەرانە
دواتر و دواتریش دیسان
لەگەڵ فەوج فەوج چەقەڵی دڕ

**یەک کەوتنەوە و گەمارۆیان دادامەوە*.**
**فیل بۆ عاجەکەی ئەکوژرێ،**
**تاووس لەبەر جوانی پەل و پۆی گیرۆدەی**
**دەسی سوودپەرستان ئەبێ؛**
**بولبول بە هەوای ئاوازی**
**ئەخرێتە ناو قەفەزەوە؛**
**هەر گیان لە بەرێ ئەکوژرێ یان بەند ئەکرێ،**
**کەڵکێ هەیە لەکۆشتنیا،**
**قازانجێ لە بەند کردنەکەی وەرئەگیرێ؛**
**من کوش ـ تن و بەند کردنم سوودی بۆ هیچ کەسێ نەبوو**
**کەچی سەدان کەس لێبڕان***
**بۆ کوش-تنم لە گیانی خۆشیان ببوورن.**
**کە باڵای دارێکی دەلال***
**دای لە دڵی رێبوارێکی خۆ بە زل زان**
**بەوندە وازی لێ دێنێ**
**کە خەڵفێکی لێ هەڵبڕێ و**
**لە ناو باخچە و گوڵدانی بەر پەنجێرەیا**
**داگیری کا؛**
**بنجێگەون لە رەقانی**
**لاپاڵی کەژێکا ئەڕوێ،**

کەتێرەبڕ* تووشی ئەبێ،
چەقۆ ئەنێتە ریشەی و
شیلەی بوونی لێ ئەسێنێ و
ئیتر دەس بەرداری ئەبێ؛
کەر ئەیبینێ
پرژ و باڵەکەی ئەخوات و
بە جێی دێڵێ؛
من لە ترسی بێئابڕوویی
کەرنەفسانێک کە ئەیانویست
لە ناو باخچە و گوڵدانی بەر پەنجێرەیا،
_زمانم لاڵ_
تەنانەت لە پشتی پەردەی نامووسیانا
خەڵفێکم لێ بگرنەوە
لە تاریکخانەی خەڵوەتا
یەکجار بووم بە بنجێ گەون
کەچی هێشتا بڕەم بڕەم*
خۆیان ئەکوتا* و خۆیان ئەکوشت
بۆ ئەوەی کە لە ریشەوە هەڵم کەنن.
□
ئەی پەروەردگاری عالەم!
بۆ کەسێ نیە پێم بڵێ

لە چارەنووسی کێ ئەچێ ئەم مەینەتە؟
ئەییووب حەوت ساڵ دەرد و ئازار هەڵی پێچا
لە پاشانا شفات پێدا و
ماوەی تەمەنی هەتا سەر
بە ناز و نێعمەت رابوارد؛
یۆسف چەند ساڵ لە بەندیخانەدا گیرا،
کە ئازاد بوو
چواربالشتی عەزیزی میسری پێبڕا؛
یەعقووب پیرێکی کامڕەوای پایەبەرز بوو
کە خەفەت تۆڕی تاریکی
بە سەر چاوەکانیا کێشا و
دواییش چاوی
بە بۆنی مزگێنی ئازیر رۆشن بووەوە؛
یۆنس کاتێ کە گرانی باری تەعلیم
لە ووزە* و توانایا نەما و
تۆراو ڕای کرد،
تەنیا بۆ کلاو چەرخانێ
خستتە گەرووی نەهەنگەوە،
هەر کە داوای لێبووردنی کرد،
گەیانتە قەراغی نەجات؛

کە فیرعەون و قەومەکانی عاد و سەموود
ملیان لە بەندەییت بادا،
لافاوی غەزەب و تۆڵەت
رایماڵین و رەوانەی دۆزەخی کردن.
من لە کاتێکەوە چاوم
بەم دنیادا هەڵیناوە*،
وا چل ساڵە،
کرمی عەزاب سەری کردووەتە هەناوم* و
شفای نیە؛
گیرۆدەی زیندان و بەندی
دوژمنایەتی هەزاران جەفاکارم و
رزگار نابم؛
تەمی خەفەت هەردوو چاومی لێڵ کردووە و
قەت نارەوێ؛
گرانی باری ئاستەمی
تەقدیری خۆ ڕاهێنان و تۆژینەوە*
نەهەنگێکە جەرگم ئەکرۆژێ؛
کەوانەی* سەرسەری* بەڵا و ڕووداوی سەخت
بێ ئەوەی تاوانم دیار بێ،
هەر رۆژێ راپێچم ئەدا
بۆ تەختی دۆزەخێکیتر

لە حەسرەت و بێئوقرەیی.
ئەوا ئێساش
لە درگانەی پیر بوون و تێک شکاویدا
بێ واسیتە لە غەیبەوە
هەوساری مەنع لەغاوم ئەکا،
ئەمر و فەرمان ئەمڕەتێنێ* و
رێی زیللەت و کوێرەوەریم پێ ئەپێوێ.
هەڕەشە و وادەی ناخۆشت
هەموو دەمێ ئەم تەزێنێ* و
داهاتووم یەکجار لەبەر چاو
ئەکا بە کۆی ئاور و دووکەڵ.
تەکلیفی ئێ-سکسوێنی ئاوەزسووتێن*
پشتم ئەچەمێنێتەوە و
وەک شەقەمشار* دامدێنێ*.
□
ئەی باشە من
لەم تاریکیە چڕ* و ئەنگوستە چاوەدا
لە بەر کامە رۆشنایی‌دا
هەنگاو بنێم؟
کەلاکی ئەم کولانە سەگە کە سەهلە
حاشا لە هەشت چینی جەننەت.

ئاواتی پلە و سەرکەوتن
هیچ کە نایێتە بەرچاوم،
تف لە ئارام بەخشی تۆڵەش.
تەنانەت نەبەردی* شێلگیر*
بۆ سەر خستنی
پەیامی ئەنجامین رێبەر
رێزەیێک لە
باری خەمی من سووک ناکا.
ئەی ئیتر هیوام بە چی بێ؟
ئارامی مەرگ
یان بێناوی و فەرامۆشی؟
بەڵام چی بکەم
دەریاییێکی بێئارامە و تیایا نوقمم،
پەل نەکوتم و خۆم داهێڵم*، تاوانبارم.
لە ناو گێژی با و بۆرانی
چوڵگەییێکی بێدەرەتانا* داماوم و
گو ـ رگ چواردەورەیان داوم،
هەنگاو نەنێم و لەسەر خۆم نەکەمەوە
ئەمرم و بێئیمانیشم.
ئاهۆ*ییێکە و تۆفانێکە تاین بووە* و
هەموو وولاتی لێگرتووم،

**لە خەڵوەتی هەزارتۆشا خۆم داشارم،**
**لە دەسی رزگاریم نایێ و**
**ئەبێ بەرگری* لێ بکەم.**
□
**فەرمووتە رەحمەتم هەیە؛**
**من تا ئێسا هەرچی دیومە**
**هەر هەیبەتە و**
**هەر برووسکەی کیبرییایە و**
**جیلوەی جەلال.**
**ئەی نووری جەماڵت کوانێ؟**
**شنەی کەرەم و رەحمەتت**
**کەی هەڵ ئەکا؟**
**هەزار و هەزار جار شوکور**
**کە سینەمەت**
**بە نووری رێنوێنی خۆت فراوان کرد.**
**وەعدە ت فەرمووە و دووپاتیشت کردووەتەوە**
**کە: "تووشی خۆشی لە گەڵە."**
**دەسا بڵێی زنجیرێ لەم دنیایەدا**
**دەس کەوێ ئەم**
**هەژدیها حەوسەرە رامکا**
**کە دەم و سات لە دەروونما**

*«سەروەسێت»*

**ئا ای‌ی ... پاسەوانانی راستی!**
**ئەمەوێ ئاسوودە بمرم**
**بەڵام ئەفسووس**
**هەر کوتێکی رۆحم لە دەم سەگێکایە.**
**ئەمەوێ کۆیان کەمەوە و**
**لە گورێچەی فەرامۆشیا**
**بیان نێمە چاڵ.**
**مەبەستم ئەو کۆگا ئاورانە نیە کە**
**لە کەناری چوارڕێکانا بەرپام کردن.**
**مەبەستم ئەو پزووسکانە* نیە کە وا**
**پەڕیون و هەر یەک بۆخۆیان**
**لە کەناری شارێییێکا**
**بو ـ ون بە کۆگاییێک ئاوور.**
**مەبەستم ئەو پولوانەیە***
**کە عەمتەر بردیان و کۆڕی**
**خۆیان پێ گە ـ رم کردەوە.**
**ئەو چرایانە ناڵێم کە**

لە چوار سووچی
بازارەکانا دامناون،
ئەو فانۆسانە ئەڵێم وا
کەوتنە دەس جەردە و ڕێگران.
لەو گۆچانانە گەڕێن کە
بۆ شەلانی بێناونیشانم کرـ دووە،
ئەو داردەسانە لە کیس چوون*
کە کەوتنە دەس شەڕلاتانان.
ئەو خنجێرانە هەر خۆش بن
کە خەباتگێڕانی حەقخوازم
پێ چەکدار کرد،
ئەوانەیانم مەبەستە
کە دەم ودەس*
لە پشتەوە خۆمیان پێکا*.
ئەو رووبارە سەر کەشانە با هەر باژوێن*
کە هیممەتی شاهەنشایانی نوورانی
کوێستانەکانی هەورامان
بۆیان رام کردم و هەڵم بەست
بۆ لادێ و شارەکانی سەر پێدەشتەکان،
بۆ بێروون* و قاقڕەکانی چوار قورنەی
ئەم جیهانە،

ئەوانەیان
کە شەیتان شوێنی گۆڕین و
لافاوێکی قوڕاوی وولّات هەڵگری
لێ ساز کردن و هەڵی کردن*
بۆ تێک دانی ئاوەدانی و
بۆ وێران کردنی مەزارکان.
چی لە بەر و بۆی رەنجی من
لە ئاکامی چەوسانەوەی بێئامانی
چل ساڵەما
لەم سەردەمی
لێڵی و گیران و رزیوی و داپێچراوی
چاو و گوێ و دڵ و رۆحەدا
بوو بە تووتیا* و بە مەرهەم* و بە هەتوان* بۆ
خوازیارانی راستەقینە
جێی خۆی گرتووە،
هاوارم بۆ
ئەو ئیکسیر* و مەعجوومانەیە* لە جەنگەی
بەربەرەکانێی* شەیتانا
کەوتنە ژێر دەس
دووڕوویانی دێوباوەڕ و

سووراو و سپیاو وکلە و
عەتریان پێ کرد
بۆ ئەو قاحبانەی کە بۆیان
ئەچوونە تاریکخانەکان.

ئا ای‌ی پەیجۆگەرانی راستی!
من دڵم بوو
بە هەزار کوت و هەر کوتەی
بە دەم سەگێکەوە رۆیی.
دەغیلتان بم
ئەگەر لەشم بێ دڵ و رۆح
چووە ژێر گڵ
بیاندۆزنەوە و بیاندەنەوە
بەو میراتبەرانەی بەڕەسمی
وەسێتم بۆیان کردووە.

١٣٧٩/١١/٢٠
قەڵەندەر

## «چارە»

کۆیلەیینە!
سەخت ژیاوم، سەختیش ئەمرم،
لێم ئەیانە*.
بەڵام هەرگیز گومان مەکەن
کە بتوانن هەستی ترس و پەشیمانی
لە دڵما جێ بکەنەوە.
ئەودەمەی کە مەست ئەبم بە
هەستی هێز و فەڕ و ئەوین،
بەستە* ئەڵێم
بۆ جوانی ڕووت، بۆ بەرتەری*،
بۆ ئەویندارێتی راستی، بۆ سەروەری.
بۆ هەڵپەڕکێی هەرە پیاوێک
لە سەر کڵی* ژان و غوربەت،
بۆ چۆڵی سەر دوندی کێوان،
بۆ تەنیایی و بۆ کۆلیلی* و خاکەسەری*.
بۆ لێڵایی* بۆرە پیاوان،
بۆ بێقەراری شۆڕەژن،
بۆ خۆ کوشتنی حۆر و پەری.

بۆ پەناپسکێی* منالّان،
بۆ ئاواتی بێپەنایان،
بۆ ئارەزووی هەلّدانەوەی گولّی سیس و مەزرای سووتاو،
بۆ حەز و تاسەی ئەوانەی کە گیرۆدەن
بە داوی مەکر و بەدفەڕی.

کۆیلەیینە!
کاتێ دەنگتان* ئەخەنە سەر کۆگای دەنگان*،
کاتێ کۆتان* لە هەزاران تێ ئەپەڕێ،
کاتێ زانا و بلیمەتتان* دەس ئەکەن بە
سکالّا* لە
دەرهێنانی هەزاران چاو،
سکالّا لە قەلّاتەی* سەرانی بڕاو،
پێمخۆشە زەق بڕوا ـ نمە ناوچاوتان و
پێتان بلّێم:
تەنیا چارەی ئێرەیی* کۆیلە ئەوەیە
هەر دوو چاوی دەربهێنی.

۱۳۸۲/۸/۱۳
رەبەت

## «لە تۆ ئەگەڕێم»

**لەتۆ ئەگەڕێم و لەبیرەوەریەکانما**
**خێڵی کۆیلە وەک سەگی هار رووم تێئەکا.**
**لە تۆ ئە گەڕێم و لەبیرەوەریەکانما**
**شاعیرە کۆیلەکان**
**لە بەر تەوژمی* هزرما***
**وەچی شێعر دەرئەکەن.**
**لە تۆ ئە گەڕێم و لە یادی**
**چەندها ئەوینی ناکاما نو ـ قم ئەبم؛**
**ئاوی ئەم دەریا وەک چەقۆ لەشم ئەم بڕێ.**
**لە تۆ ئەگەڕێم و ژیانم**
**مۆمێکی* روو لە خامۆشیە**
**بە گڕی بیرەوەری ئەسووتێ.**
**لە تۆ ئەگەڕێم و دیواری**
**ئەم کۆخە* ڕووتە بە دیانی**
**خشتەکانی ریچەم لێئەکا*.**
**لە تۆ ئەگەڕێم و لە کەوای**
**ووڕە بەرداوی* تەنیایی‌دا**

کزکە ئەکەم.
لە تۆ ئەگەڕێم و لە ئاسۆی بەرتەسکی لێڵ و چڵکنا
چاوەڕوانی هەڵها ـ تنی هیچ ڕۆژێک نیم.
لە تۆ ئەگەڕێم و شەفەق*
ئاڵای شەڕێکی خوێناویە
کە پاش تێکشکان کەوتووە.
لە تۆ ئەگەڕێم و ژیان بە سەرمدا رووخاوە،
هەر ئەڕۆم و تاتکەم دێ*.
لە تۆ ئەگەڕێم و ئاسۆی ڕۆژهەڵاتم
بە شەوقی بەڵێنێکی دوورەدەس
نە ـ خش ئەگرێ.
لە تۆ ئەگەڕێم و بووکی ئاواتی من
بێز لە قۆزی* سەردەمی لاوێتیم ئەکا؛
بێز لە تین و گوڕ و پاراوی.
لە تۆ ئەگەڕێم و شوغڵی گ ساتێکم
گۆرانییێکی کۆنە بە باڵای تۆدا.
لە تۆ ئەگەڕێم و خۆراکی تاڵی سە ـ بر
قەت لە دەمم داناکەوێ.
لە تۆ ئەگەڕێم و لەززەت
چۆڕێ ئاوە و کولێرەیێکی ووشک
کە سواڵ ئەکرێ.

له تۆ ئەگرێم و تۆم لێ دیار نیت؛
تۆ قۆزی*، بە پۆزی*،
دڵبەرێکی زۆر جیهان ئاڵۆزی*.

١٣٨٢/٩/٢٧
رەبەت

## *«چوار خشتەکی»*

**خەونێکە ژیان  ئاڵۆز و پڕ نەخش و نیگار**
**خافڵان ـ دمی بۆ ماوەیێ ئەو بــێئیختیار**
**تا ڕایچڵــەکانم دەسی بێرەحمی مە ـ رگ**
**فاتیحــا دادە بۆ منــی مەستـــەخەســـار*[١]**

**١٣٨٤/٦/٢٣**
**رەبەت**

[١] ئەم چوار خشتەکیەم بۆ سەر کێلی گۆڕی ناسیاوێک ووتوە.

## «چوارخشتەکی»

**ئەم دوو دانە چوارخشتەکیەم بۆ سەر کێلی گۆڕی خۆم نووسیوە:**

**بە ناوی حەق**

**تۆژیمەوە*، روانیم، بە درێـژی تەمەنم**
**مانـای جیهـانم خستە ژێـر کـەمـەنـم***
**هەرچی هەیە دەسکاری ئەوە، مل کەچ کە**
**لوتفی حەق و فاتیحەیە پـــردی جەهەنم**

***

**دەریایە جیهان، شەپۆلەکـەی سـامناکە**
**گەمیێکی چکۆلانـەیـــە عەقڵت کـاکــــە**
**کەشتیت گەرەکـە محـەممەدە و ئالی ئەو**
**فریا کەوی خـۆت دەربـاز کەی وا چاکـە**

١٣٨٤/٦/٢٤
رەبەت

## «ستایشی مامۆستا»

تاجی سـەرم مامـۆسـتا        ئـەی واریـسی* ئـەنـبـیـا
من سەر کوێر* و نەزانـم        تـۆ رێـبـەر و رێـنـومـا*
جۆگـەیێـکی بچـووکـم        تـۆ مـن ئـەکـەی بە دەریـا
چاو و گوێچـکەم بکـەوە        پـێـم بـنـاسـێـنـە دنیـا

پەڕ و بالـم پێ بدە
رۆحێ بکە بە بەرما

بە گرمەی هـەوری بەهار        گـوڵ ئەپشـکوێ لەگوڵـزار
بە ئـاوی کانـی و زنـاو*        بـالا ئـەکـا سـپـیـدار*
بـە لێشاوی* شـەتاوان*        پـڕدار ئـەبـێ لـێـڕەوار*
بـە نـفـووسی* پیرۆزت        مـن ئـەبـم ژیـر و هۆشیـار

پەڕ و بالـم پێ بدە
رۆحێ بکە بە بەرما

زوڵمـات* و شەوەزەنگە*        سـیـاسـەت هـەزار ڕەنـگـە
لە حاستی مـافی مـرۆڤ        سـەدەی ئـەتـوم بێـدەنـگە
ژیـنی گـەلانـی بـندەس        یەکجار سـووک و بێسەنگە*
تەیـارم کـە* بە زانسـت        بچـمـە کـۆڕی ئـەم جەنگـە

پەڕ و بالـم پێ بدە
رۆحێ بکە بە بەرما

لـەم سـەردەمـە بەدناوە        مـەعـنـەویـیـەت نـەمـاوە

لـــەوەڕان و جنـسـیـەت تــــەنـیـا شـتـێکە بـاوە*
سـەرمـایـە ئەپـەرستـن خـــودا لـە بـیـــر کـراوە*
بـــڵـێ ئـەمـــن زۆرداری چـۆن نـەهێـڵم لــەم نـاوە
پەڕ و باڵــم پێ بدە
ڕۆحێ بکە بە بەرما
مامۆسـتا بینـایی چـــاو ئەی بــەندی دڵ و هــەنـاو
نوور و گەرما دابەش کــە بــدرەوشێوە* وەک هەتــاو
بگرمــێـنە وەکـوو هــەور دابــارێ بــە گـوڕم* و تاو*
گیان ببەخشە وەک بەهار ب ـ خرۆشێ وەک شـەتاو*
پەڕ و باڵــم پێ بدە
ڕۆحێ بکە بە بەرما[١]

١٣٨٥/١/١٥
ڕەبەت

---

[١] ئەم شێعرەم بەشێوەیێکی سەرپایی بۆ قوتابیانی شاری ڕەبەت ووتووە کە وەک سروود و بەستەی ڕۆژی مامۆستا بیخوێننەوە.

## «دۆڵ و دەرەکان»

گوناه و خافڵان وەکوو لاڕێیە
کە حەیران بوویت و لە ڕێگەت لادا،
دەرە بە دەرە و دەشت بە دەشت ئەڕۆی
نازانی کوێیە.
لە دوای هەر دەرە دەرەیێکی‌ترە
کە تەی کر ـ دنی لە دەرەی ئەوەڵ
گەلێ ز ـ یاتر
پڕ سام و ترس و پڕ دەرد و سوێیە*.

سەڵاح و چاکەش دەشت لە دوای دەشتە،
کە تێی کەوتیت و هەنگاوت تێ نا
بست بە بست زیاتر
سەفا و سەیران و خۆشبەختی لێیە.

دەسا ئەی هادی، ڕێبەر، ڕێنوما*!
ئەی ئەو کەسەی کە چارە ئەنووسی و
هەوساری نەفسی خەڵکانت پێیە!
بمان پارێزە لە هەڵە بوون و

به ڕێبازێکا بمان ئاژوێنه*
کەخۆت ئەزانی ئەوە شارێیە.

١٣٨٥/٤/٥
ڕەبەت

## «مەلەکووت»

**پام لە سەر زەویە، سەرم لە هەوا**
**چ شنەییێکی خۆش دێ لە سەرڕا**
**ئەمە مەلەکووتی ئاسمان و زەویە.**
**چ زینووم، چ سووک، چ رادە رووناک!**
**زەڕڕەییێک چیە زەوی هەست ناکەم**
**لە ژێری پاما.**
**چی دی پێویستیم نەماوە سا بە خۆراکی زەوی**
**خۆراکم تەنیا لە جنسی نوورە.**
**بوومەلێڵێکی تەنک و رووناکە،**
**وەکوو کازیوەی بەری بەیانی،**
**وەکوو ئێوارە هەورێکی بەهار.**
**نەرمە بارانێک بڵێی ئەبارێ و بڵێی نابارێ،**
**خوناوەییێک لە رەحمەتی یەزدان،**
**نەک لە سەر لەشم، لە ناخی گیانما.**
**چەنێ بێنەقسە جەریانی ژیان!**
**چەنێ بێعەیبە بنیادی گەردوون!**
**هەر کوێرەوەری و دەرد و ئازارێک دەرووی رەحمەتە.**
**هەنگاو هەڵناگرم مەگەر بە فەرمان.**

من لێرە ئەڕۆم.
چ کورتە دەرفەت لە بۆ مانەوە!
چ ناگرینگە باری رابواردن!
تێپەڕینێکە بەس رووەو هەوراز.
بەرجەوەنی* بەر چاوم چەند خۆشە!
هەموو شت نوقمی رەحمەتە و هەموار*.
ئەبێ تێپەڕم بە بێ دەنگ، ئارام.
چەنێ ناحەزە شڵەقان ــ دنی ئەم ئارامییە.
هەموو شت زینووە و بەهەستە و هۆشیار.
دەخیلتم نەکەی کە ترپەی پات بێ، هەر بفڕە بێ باڵ.
روو لە لای هەوراز، روو لە لای هەوراز!!!
شو ــ کر لە دوای شوکر، دیسانیش شو ــ کر!

هاوینی ١٣٨٦
بۆکان

**«چرپە»**

**ئازیزەکەم**
**چۆن ئەتوانم بانگێشتنت کەم**
**بۆ تەماشای گۆلێکی ووشک**
**من کە رۆژێک فەرمانڕەوای زەریاکان بووم!**

**بە چ شتێک میوانداری لە تۆ بکەم؟**
**کامە شادیت لەگەڵ بەش کەم؟**
**بە کام هێز و کام تین و گوڕ**
**لەگەڵ خۆما بتبەمە سەر ترۆپکەکان**
**بۆ سەیران و بۆ تەماشا؟**

**ئازیزەکەم درەنگ هاتی.**
**بەهار رۆیی**
**بە خۆی و بە ئاسمانێک خەیاڵی سەوزەوە،**
**بە خۆی و بە شنەی خۆشی بلاوێن و**
**خوناوەی* پڕ لە ئارەق و**
**هەڵ قوڵینی بێئامانی زوڵاڵ و رووناکی کانی و**
**گرم و هۆڕی شەتاوان و**

لەشی یاو* کردووی دارستان
بە هوڵمی* شەونمی تازە
لە ژێر گەرمای چێشتەنگاوا.

هاوین رۆیی
بە لەززەتی گەینی دەنک و
پوختە بوون و شیرین بوونی
میوەی کاڵ لە
تاوی سووری گەلاوێژا،
بە لەززەتی
مڕ بردنەوە و قووڵ بوونەوە
لە خاوی و مەندی* سێبەری بن دارانا.
مەزرا چۆڵ بوو.
باخەکان گشت رووتانەوە.
شەختە کەوت و
دەمی سروشت رچی دا* لە نەغمەخوانی*.

درەنگ هاتی!
ئای چەنم چاوەڕێ کردی،
چەن لێت گەڕام!

سوام سوام بە دەردی ئینتیزاری تۆ!
ئەم چاوەڕوانیە زا ـ ڵمە
بۆ هەر رۆیشت و کۆتایی هەر پێ نەهات و پێ نەهات و پێ نەهات؟!

رێگەیێکی پڕ ئاستەم بوو کە من بڕیم؛
ئاسان نیە
کە تۆ نان و جوانی و خودا
لە نیزامێکی رۆ ـ شنا
بە یەکەوە ئاشت کەیەوە.

نان ئاسان بوو
بەڵام من پڕ بێزم ئەکرد لە ژیانی گڵەخۆرکە*.
بۆم نەئەکرا و دڵم رێگای پێ نەئەدام
کە ژیانم تەرخان بکەم* بۆ لەوڕان؛
ژیانی مەڕ، ژینی بەراز!...
چی بکەم پشووم پی سوار ئەبوو.
ترسام، ترسام!
لە هەڵە بوون، لە لاڕێ بوون،
لە دامانی ناو دەربەند* ئەترسام.
نەموێرا پا بنێمە ناو ئەم رچەیە*.

**نەفرەتم ئەکرد، نەفرەتم ئەکرد**
**لە ژیانی ئەم رەوە چنۆکە***
**کە بە هەر شتێک ئەگەیشتن هەر ئەیانخوارد، هەر ئەیانخوارد.**
**گ شتێکیان هەر مەسرەف ئەکرد.**
**جوانیشیان هەر مەسرەف ئەکرد.**
**خوداشیان هەر مەسرەف ئەکرد.**
**پێوانە بۆ هەموو شتێک هەر خواردن بوو.**
**گ شتێکیان هەر داگیر ئەکرد.**
**ئەم مێروروانە**
**بە هەر شتێکا ئەگەیشتن**
**کێشەوەیان ئەکرد* بۆ ناو کونی خۆیان.**
**هەر زەخیرە، هەر زەخیرە!**
**هەموو شتێکیان بە تەنیا بۆ خۆیان زەخیرە ئەکرد.**

**جوانیش هەر وا ئاستەم نەبوو**
**بەڵام ئەویش ئالوودە بوو،**
**ئەویشم هەر وەک لاڕێ ئەهاتە بەرچاو.**
**خێڵی کۆیلە**
**جوانیەکانیان چڵکن ئەکرد؛**

گەنیو ، رزیو ، بۆگەن ، دزێو.
خۆیان پیان وابوو جوانی بوو!
من جوانیم هەر تەنیا لە سەر شارێ ئەویست
لە ناو نیزامێکی رۆشنا.
ئەوان جەستەی ژنیان ئەویست ،
لەگەڵ ژنا نەئە ـ ژیان.
ئەوان ژنیان مەسرەف ئەکرد.
هەر جەستە بوو ،
هەر ئەونە بوو جەستەی ژنیان
لە جەستەی کەر پێ چاکتر بوو ،
جەستەی ژن لەماڵشتی ئەندامی خۆیان لەزیزتر بوو.
هەزار ئەفسوون* لە رێما بوو...
هەرگیز رووم لە بەرێک نەکرد
کە بە باوشی ئاواڵەوە پێشواز نەکرێم
بەڵام ئەمن قەت قەت هەوسارم بەر نەدا.
چی بکەم لە گوم بوون ئەترسام ، لە لارێ بوون.
ئەترسام دڵم ژەنگ بێنێ و
تازە هەرگیز نەتوانم تیفتیفەی* بدەم
بۆ نواندنی وێنەی ئەوین.
نەفرەتم ئەکرد ، نەفرەتم ئەکرد
لە نیگای دڕدۆنگ* و خێسی

منالّانی پاکی مەزلّووم.
نەفرەتم ئەکرد
لەو کرمانەی کە بە بێدەنگ
ئەخزێنە ناو جەستەی ژینی پیاوێکی زەحمەتکێشەوە.
نەفرەتم ئەکرد
لەو بۆشاییانەی* ئەخنران
بە هەستی تاریک و تالّی
خەیانەت و بێزاری و سەرشکەستەیی کەسانێک کە
هەوای ژینیان
بە دامرکانی ئاووری ئان و ساتی خواستێکی پیسی حەیوانی ئالوودە ئەبوو.

رەنگە خوداش بەوجۆرە ئاستەم نەبووبێ
بەلّام ئاخ لە سەرگەردانی ئەم چەرخە خۆ گوم کردووە
بێنێرک* و بێناوەرۆکە!
ئاخ لەم هەموو چڕە و گوڕەی
ئەم خێلّی کوت و کوێرانەی* کە ئیددیعای پێغەمبەرایەتی ئەکەن!
ئاخ لە زەڕەی ئەم ئایینە درۆزنە نارەسەنانەی
کە سەرپاکیان ناقی ـ سن و خوار و خێچ و ناهەموارن!

ئاخ لەو هەمووو دەمارگرژی* و تەپ و تۆز و کوشت و بڕە!
ئاخ لە قاوی
شەیتانانی جیننی و ئینسی
کە هەر یەکەی بانگێش ـ تنی لاڕێگە و بێڕێییێک ئەکەن!

ڕەنگە خودا و نان و جوانی هیچکامیان ئاستەم نەبواییێن
ئەگەر کینە و دوژمنایەتی کۆیلەیان لێم گەڕایێ
بەڵام چی بکەم،
کێم بکوشتبا؟!
یەک نەبوون و دوو نەبوون و هەزار نەبوون،
دێییێک نەبوون، شارێک نەبوون،
ناوچەییێک و مەڵبەندێک و وولاتێک نەبوون،
وا ئێسا تازە ئەزانم جیهانێک بوون!
دڵی کێم بە دەس هێنابا؟!
هیچ سووچ* و هیچ خەتاییێکم بەرانبەر بە هیچیان نەبوو.
خۆم لە کامیان بپاراستبا؟!
ڕێزەییێکیش هیچ زەڕڕێکم* بۆ مافی هیچکامیان نەبوو.
ئەوان تەنیا
لەگەڵ بوونی من دوژمن بوون،
لەگەڵ بەشی سروشتی من ناتەبا* بوون.
پیان وا بوو کە بەشی ئەوانم خواردووە و نەشم خواردبوو.

**کوا بۆم ئەکرا...؟ تێکیان دەم و سەر لە نوێ دروستیان کەمەوە؟!**

**دڵمەندی* بێدادگەری گەردوون بوون،**
**تۆڵەیان لە منی کوڵۆڵ ئەکردەوە.**
**بە بەشی خوا نارازی بوون،**
**کینەیان لە من ئەکێشا.**
**ئەوان تەنیا**
**رقئەستووری بارسووکی و بە ـ رز روانین و**
**ئەویندارى دڵی من بوون؛**
**ئەیانویست کە بە جەزرەبەم**
**تۆڵەی رزگاری رۆحمم لێ بکەنەوە.**
**ئەیانویست بمگۆڕنە خۆیان.**
**چ جەورێکی ئێ ـ سک سوێنی بێئامان بوو**
**کۆتایی هەر پێ نەهات و**
**دەسیان لە کۆڵ نەکردمەوە و**
**پەناییێکم هەر دەس نەکەوت.**
**سەردەمێک پێم وابوو ئەکرێ**
**هەر بە هێزی دەس و بازو بڵاویان کەم.**
**زەمانێک پێم وابوو ئەکرێ**
**بە هێزی مێشک و فکری خۆم دڕیان پێ بەم.***

**بەڵام پاشان... تۆقیم، تۆقیم!**
**تێ گەیشتم کە بە غەزەبی خودا نەبێ**
**بە هیچ باشاریان نەئەکرا***
**بەڵام ئەفسووس**
**محەممەد کە دوایین پێغەمبەری خوا بوو**
**نزا* و نەفرینی لەم خەڵکە نەکر ـ دبوو**
**کە برووسکەی غەزەبی خودا لیان بدا و**
**وەکوو قەومی عاد و سەموود بیان فەوتێنێ.**
**چ شەڕێکی جە ـ رگبڕی دڵتەزێن بوو**
**شەڕی ئاڵۆزی ئاوێنە چەوتە خەیانەتکارەکان،**
**ئاوێنە کینەبەرەکان،**
**ئاوێنەگەلی داخ و دیق!**
**قەت نەیانهێشت روخساری خۆم راست ببینم،**
**وێنەکەمیان هەر شکاند و هەر گۆ ـ ڕیان.**
**چەنی پێ چوو هەتا توانیم**
**لە سەر شەپۆلی رەنج و دەرد**
**لە سەر تا پای خۆم بڕوانم!...**

**هەتا توانیم لە سەر شاڕێ**
**لە ناو نیزامێکی رۆشنا**
**جوانی و خودا بدۆزمەوە؛**

پاییز داهات،
سپیداری لێڕەوارەکان وو ـ شک بوون،
کانی کڕ بوو،
شەتاو لە قەڵبەزە* کە ـ وت،
زەینی ئاسمان
لە خەیاڵی سەوز بەتاڵ بوو،
مەزرا چۆڵ بوون،
گەرمی و بزاو* لە کێو و دەشت و دەر تارا.

بەڵام نان، ئاخ...
خێڵی کۆیلە
نانیان هەر لێ تەریک کردم*.
نانیان هەر لێ داگیر کردم.
نانم لێ چووە سەر پشتی شێر...

ئازیزەکەم درەنگ هاتی!
بە چی میوانداریت بکەم؟!
کوا ووزە* و تاقەتی سەیرانگا؟
کوا هەڵچوون و کوا تۆفان و کوانێ چیا؟
کوا رسکان* و کوا هەڵدان* و کوانێ گەرما؟

ئەو ئامێرەی لێ دانی دڵ تۆمار ئەکا،
ها ... بڕوانە لە ژوور سەرم
هێڵێکی راست نیشان ئەدا.
دەور و بەرم هەتاکوو چاو هەتەر ئەکا*
بێروونێکە* بێبزاو و چۆڵ
کە وا لە ژێر توێژێ زوقما* رچی داوە*.
دەردە و دەردە و دەردە و دەردە،
سەبرە و سەبرە و سەبرە و سە ـ بر!
ئازیزەکەم ئەگەر هاتی
زوهد و سەبر لەگەڵ خۆت هەڵگرە.
سەیرانگاکەت
لێواری گۆلێکی ووشکە!

١٣٨٩/١/١٠
بۆکان

### «شادی»

**وا بەهارە.**
**وولاَت سەوزە.**
**ئاسمانی بێگەردی سامالّ**
**وەکوو چاوی تافی* لاوی،**
**وەک خەیاڵی ئەویندااران،**
**رووناک و پاک ئەنووێنێ، کالّ و کەژالّ*.**
**لەشی سروشت وەک ئەندامی تازە بالّغێک**
**بەهانای* گەرمای دەروونی یاوی* کردوە؛**
**بە شنەییێکی فێنک و ئاودار**
**بە نازەوە روخساری خۆی خەریکە باوەشێن ئەکا.**
**مەیلم لێیە جارێکی‌تر**
**لە سەر ئەم بەستێنە* خۆشە**
**گیانی شادی رەسەد بکەم*.**

**من هەمیشە لە دوورەوە گیانی شادیم رەسەد کردوە.**
**هەرگیز شادیم لە باوشی خۆم نەگرتووە.**
**شادی بۆ من دایم و قایم* بەرجەوەنی* روانگە بووە**

وەکوو وێنەی گۆ*یێکی ئاسمانی،
وەکوو نەخشی ئەستێرەیێک.
مەقسەدێک بووە دوورە دەس
کە بێووچان بەرەو لای ئەو ئاژواووم* و رووم لی بووە.
هەر کاتێکیش لێم گوم بووە،
سەر لە نوێ رەسەدم کردوە.

کاتێ لاو بووم،
هەر کە شادیم لێ گوم ئەبوو،
بە یارمەتی ئەو گڕکانەی*
لە دەروونم هەڵ ئەقوڵا،
بە پشت ئەستووری رۆ ـ ژگار کە درێژ بوو،
بە شەوقی ئەو ئاسۆیانەی کە لە ئێسا روونـاکتر بوون،
خێرا ئەکەوتمە سۆراغی و
داناکەوتم تا نەخشێکم بۆ ئەنەخشان.
هەر چەند ئەودەم
نەخشی جوانی تار و لێڵ بوو؛
تاپۆیێک* بوو، تارماییێک* بوو؛
ئان و ساتی* و کەوشەنتەنگ* و بێدەوام بوو.
ئەودەمانە هەر چیم ئەکرد بۆم نەئەکرا
کە ئەم نەخشە پەیوەند بەم بە ئاسمانەوە،

پەیوەند بەم بە ماوەڕاوە*.
دنیای ئەودەم زەمینی بوو.
دنیای ئەودەم بچووک و خۆڵین بوو.
ئەو دەمانە
هەوای دەورم ئاخنرا بوو
بە تەم و دووی* پیس و خەفەی*
ئاوات و ئاڕمانجی کەرنەفسان.
ئای لە شادی ئەم کۆمەڵە کوت و کوێرە*!
ئای لەو شادیە چڵکنە چووکانە
کە وەک نارنجۆکی دەس‌ساز
لە پڕێکا ئەیانکوتا بە زەوی‌دا و ئەیانتەقان؛
ئەیانتەقان و جا خۆشیان هەڵ ئەتۆقین
بە شریخە و تەپ و تۆز و چڕەدووکەڵی بۆگەنی.
ئای لەو گولۆڵە شادیانەی
کە شێوەی ئەو تۆپەوانە* پەڕۆیینانەیان ئەدا
بۆ خنینی گونجەی* ئاوەڕۆ بە کار دێن.
ئای لەو شادیە خاکینانە
کە ڕێزەیێک پەیوەندییان نەبوو لەگەڵ
ئاسمان و گزینگ و باران،
کە هەر وەکوو هەڵفڕینی شیاکەگلێن*

ڕێزەیێک پەیوەندییان نەبوو
لەگەڵ ئاسۆ و لەگەڵ شەبەق*.
شادی دەسکردی* فریودەر.
شادی بەرتەسکی بێدەوام.
شادی فێنکی توێژکاڵێ ماست
لە سەر پێسی ئەندامێکی داپڵۆخاو*.
شادی هەڵێنجانەوەی دڵی پڕ
بە زۆرداری و قامک پێکان*.
ئاسوودەیی بەتاڵ کردنی
سکی ماسیو بە ناپارێزی لەوەڕان.
ئای لە شادی ئەم کۆمەڵە چارەڕەشە
کە هەر وەکوو
گێژەڵووکەی جەنگەی نیوەڕۆی گەلاوێژ
لە پڕێکا تێ هەڵ ئەبوو و لوولی ئەخوارد و
قەف قەف هەڵ ئەکشا گژە گژ*،
هەموو شتێکی تێک ئەدا و هەموو شتێکی ئەڕووخان.
ئای شێتانە شادیان ئەکرد! مەئیووسانە شادیان ئەکرد!
هەر لە تۆفانێک ئەگەڕان
کە گێژیان دا و رایانپێچێ و سەریان مەنگ کا
وابێ خۆیان فەرامۆش کەن.
لە تەقینەوەیێک ئەگەڕان

گوێیان کپ کا و هیچ نەبیسن.
پاروویان لە زووخ و کیمی برینی هەژار وەر ئەدا و
شادیان ئەکرد.
خوێنی داوێنی کیژووڵەی ناباڵغیان بە فەتحی شادی ئەزانی.
لە باووشی پیرە قاحبەی فەرزەندکوژا ئەخەو ـ تن و
شادیان ئەکرد.
کایەیان بە شێتانی خەمبار ئەکرد و پێ ئەکەنین.
مناڵانیان ئەتۆقان و ئەگریان و تریقە تریق ئەتریقانەوە*.
هیچ نێعمەت و کامڕەوایێک*
بە ئەندازەی تەماشای رەنج و ئازاری چارەڕەشان
هەستی خۆشی و بەختەوەری پێ نابەخشین.
هەزاران پرسیاری زەقیان
لە تەختی رۆحی خۆیانا ئەنا چاڵ و
ئابەمە ئارامیان ئەگرت.
کەلێن و قەڵەشی رۆحی ساردی خۆیان
بە کاگڵی بێدەربەسی ماڵە سواخ ئەکرد و خۆیان
بە ساغ و تۆکمە* ئەزانی.
لە ناو زیڕەی ئامێرانی مۆسیقادا
هاواری ئێشی دەروونیان ئەشاردەوە و
پیان وابوو کە رزگار بو ـ ون.

چواردیواری پەناگەی عەقڵی خۆیانیان
بە لافاوی ئەلکول یەکجار تێک ئەڕمان* و
پێیان وابوو کە پەیوەندیان بە ئاسۆی دوورەوە بەستوە.
سواری تۆفانی شەهوەت ئەبوون و پڕ بە پێسیان هەڵ
ئەپەڕین،
پیان وابوو کە ئەم رۆچوون و نوغرۆ بوونە*
رسکان* و گەشە کر ـ دنە.
بە نیگای خێس و مۆنی مەرگ زاڵەتەرەک* بوون و کەچی
بە هێرشی دڕندانە و بە کوشت و بڕ
بە هەو هەوی دزی و تاڵان
بە زەخیرەی ماڵ و سامان
چاوی مەرگیان ئەشاردەوە و پیان وابوو کە بەختەوەرن.
شادی ئەم قەومە پووچەڵە بێئامانجە
چلتیکەیێکی* نەخشین بوو
کە کیژووڵەیێکی لادێیی
بۆ سەرگەرمی سازی کردبوو
هەر کوتێکی پەڕۆی سەر تەپۆڵکەیێک* بوو،
ناونافەک و پزووی دەرپێی دژوێنێک* بوو،
بۆنی گەڵی سۆزانییێکی لێ هەڵ ئەسا.

کاتێ لاو بووم

**هەردەم شادیم رەسەد ئەکرد**
**زووتر ئەمتوانی نەخشی کەم**
**بەڵام ئەودەم نەخشی شادی**
**رووناک و تۆکمە* و تۆخ* نەبوو.**
**ئەودەمانە وەک ئەمڕۆکە ئەزموونی خەڵوەتم نەبوو.**
**ئەودەمانە شەیتان زیاتر**
**دەسی ئەڕۆیشت بە سەرمدا.**

**ئەمڕۆ لە سەر ئەم بەستێنە**
**کە سروشت وەک بووکی تازە رازاوایە و**
**لە خورپە و مەراقا* لەشی نەرمە یاوێکی کردووە و**
**ئارەقی شەونمی تازە لە سەر گۆنای داگرساوی**
**بە شنەبای چێشتەنگاوێ خەریکە باوەشێن ئەکا،**
**مەیلم لێیە جارێکیتر**
**شادی بۆ خۆم رەسەد بکەم.**
**هەرچەند ئێسا لەشم وەکوو داربیێکی هەڵ پڕووکاو**
**بێنەشەیە،**
**هەرچەند کە رۆژ چی بە بەرەوە نەماوە و**
**ئاسۆی روانینم تاریکە.**

پرسێک وەک کوتک لە سەرم ئەدا:
«لَـقَـد خَـلَـقـنا الانسانَ فی کَـبَد»[1]
بلێی شادی راسەقینە
لە سەر رووی ئەم گۆ* خۆڵینە
لە بنەڕەتدا هەر گونجاو بێ؟!...
ئەگەر چی لێم سوورە کە خوا
خەمی بەندەی لە شادی ئەو خۆشتر ئەوێ،
ئەگەر چی لێم سوورە کە خەم
لە شادی سڵامەتترە،
نابێ بێڵم کە خەم یەکجار بەیدەسم کا*؛
نابێ یەکجار رابوەستێم،
نابێ رۆچم.
«لا یَـیأَسُ مِن رَوحِ اللّهِ الاّ القَومُ الکافِرون»[2]
بەڵێ راسە «کەبەد» هەیە،
بەڵێ راسە ئەم دنیا سەرای* ئەزموونە،
هیچ گومانێکی تیا نیە کە خوداوەند
زیاتر هەر بە مەحەککی سەبر
ناتەواوی یان تەواوی ئیمانی بەندە دەر ئەخا،
راسە کە خەوش و خاڵی دڵ
هەر بە سە ـ بر ئەپاڵێورێ،

بەڵێ ڕاسە کە سریوەی* سەمەدییەت و کیبریا
جەرگی بەندە ئە ـ ڕزێنێ
بەڵام ئاخر ڕەحمیش هەیە، لوتفیش هەیە،
کەرەم و بەندلاوێنیش سوکنا و سەکینە ئەبەخشێ.
«فـاِنَّ مَـعَ العُسرِ یُسرا،
اِنَّ مَـعَ العُسرِ یُسرا»[٣]
بەڵێ ڕاسە ئەییووب هەبوو، یەعقووب هەبوو، مەسیح
هەبوو
بەڵام سولەیمانیش هەبوو، یۆسفی نازداریش هەبوو.
بەڵێ ڕاسە عەلی هەبوو کە ئازاری دەروونی خۆی
تەنیا لەگەڵ چاوانەی چادا ئەدرکان،
کە سەرئەنجام ریشی سپی بە خوێنی تەوێڵی پاکی
ڕەنگین کرا.
بەڵێ ڕاسە حەسەن هەبوو، حوسەین هەبوو،
ڕاسە کە ئیمامی سەججاد
لە شیوەنی شەهیدانی کەربەلادا ئەونە گریا
فرمێسک ڕوومەتی نازداری بریندار کرد،
بەڵام ئاخر مووسای کازم و مووسای عیمرانیشمان هەبوو.
ئەی نەتدیوە شای ئەنبیا، محەممەد سەروەری مەخلووقات
بە پیری تازە ژیاوە و بە خۆیا هات؟

ئەی نەتدیوە ژن و عەتری
پەیوەند دا بە ئاسمان و بە ماوەڕاوە،
پەیوەندی دان بە مشتووی* شیر*ی شەڕەوە؟!
بەڵێ راسە حەللاج هەبوو
بەڵام مەولانا خالید و شاهی سیراجەددینیش بوون
کە ماوەی عومری ئازیزیان لە ئاسا ـ یشا بردە سەر.

هەر وا لە گەڵ جەریانی ئەم ووت و ویرە*
ئەگەڕێم و گیانی شادی رەسەد ئەکەم
لە ئاسمانا، لە رووبەری دەشتی سەوزا،
لە تاو و یاوی بەهارا،
لە ناو دێهاتی بڵاو و لە ئەم شار و لە ئەو شارا،
لە ووڵاتانی نزیک و دوور،
لە رابوردوو، لە داهاتوو،
لە تاریکی شەوی مەندا
لە ژێر تیشکی سەرچاوەی نوور.

سەرئەنجام کردەم کۆ ئەگرێ* و
گۆی خاکینی رازاوە بە گیانی بەهار
پەیوەند ئەدەم بە ئاسمان و ماوەڕاوە،
بە خوداوە،

**ڕۆحی جوانی و خڵتەی لاوی لێک ئەدەم تا**
**تین و گوڕێکم دێتە بەر**
**چاوی مە ـ رگ ماچ ئەکەم و**
**هەست و خوستم هەوێن ئەکەم**
**بە شیلاوکی* سەبر و رەزا،**
**ڕۆحم ئەبەمە ژێر مێحرابی پیرۆزەیی* پەسەند* و نوێژ،**
**ئەوساکە بە دوو باڵی ئەوین ئەفڕم و**
**لە فەزای لایەتەناهیا**
**گیانی شادی ئەدۆزمەوە.**

**١٣٨٩/١/١٦**
**رەبەت**

---

[١] ئایەتی ٤ لە سوورەی پیرۆزی «بلد»، واتە: بە راستی ئێمە ئینسانمان لە رەنج و دەردا خولقاند.
[٢] ئایەتی ٨٧ لە سوورەی پیرۆزی «یوسف»، واتە: جگەد لە قەومی کافران کەس لە رەحمەتی خودا ناهومێد نابێ.
[٣] ئایاتی ٥ و ٦ لە سوورەی پیرۆزی «شرح»، واتە: بە راستی تووشی و سەختی خۆشی لەگەڵە.

## «شی کردنەوە»

هەر کاتێ کە دەردەکانت شی وە ئەکەی،
هەر تەنانەت
ئەگەر ژانی دیانێکی ناوخوراوە بوو،
ئەگەر خەمی
سەر هەڵدانی تاڵە موویێکی سپی بوو،
دەغیلت بم، هەرگیز، هەرگیز
ئەو پیلان و دهۆیانەی*
کە لەو بەری دەریاوە دێن،
لە تەرەفی رۆژئاواوە تێ هەڵ ئەکەن،
وەکوو هۆییێکی سەرەکی
لە بیر نەکەی!

١٣٨٩/٢/١
رەبەت

***«فەرهەنگی کورد»***

**سەردەمانێ میرێکی گەردنکەشی کورد**
**ئامادە بوو کە هەموو جیهان داگیر کا.**
**شیر*ەکەی و ئەسپەکەی و نۆکەرەکان و سەگەکەی**
**کە بەم هەواڵەیان زانی**
**هەموو شێت بوون.**
**هەموو تێکڕا بایان داوە و**
**پەلاماریان بردە سەر میر.**
**میر پەشۆکا و شپرزە* بوو.**
**لەو حاڵەدا دوژمن هات و گەیشتە سەری.**
**دەسێک و لاقێکیان پەڕان.**
**میر تێک شکا و مجرۆ* ماوە و لە پاشان کەوتە سواڵ کردن.**
**شیر چەماوە و بوو بە گۆچان.**
**ئەسپی سەرکەش بوو بە کەرێکی رام و نەرم.**
**سەگی هار دامرکایەوە و دەسەمۆ بوو و**
**کەوتە شوێنی.**
**نۆکەرەکان ملیان لە کار و کاسپی نا و**
**بە خێو کردنی میری خۆیان گرتە ئەستۆ.**

**ئێمە ئاواین:**

**بە ئەمەگ و خێرەو مەنین** (!!!)

**١٣٨٩/٢/١**

**رەبەت**

## «سێ پیلان* ، سێ گرێ کوێرە ، سێ دەرد»

جارێکیتر وورد بڕوانە لە گۆی زەوی ،
تا ئێسا بەمەت زانیبوو کە زاگرۆس نێرکی* زەمینە؟
زانیبووت کە
ئەم زنجیرە چیا چڕە
زەوی ئەکا بە دوو بەشەوە؟
زانیبووت کە لە بەرەبەیانی مێژووەوە
ئەم بەر و ئەو بەری زاگرۆس لێک جیاواز و
بەیەکەوە ناتەبا بوون؟
هەمیشە بەری رۆژهەڵات چاوی هەر لە ئاسمان بووە و
بەدایمە هەر ویستوویەتی خاک بە ئاسمانەوە پەیوەند با و
هەستی حەیوانی پێشێل کا و لە بەندی ئەم خاکە رەشە خۆی
دەربازکا.
هەمیشە لە جیهانی دوای ئەم دنیادا بۆ بەختەوەری گەڕاوە.
هەمیشە ژینی دنیایی بە جێی کشت و کاڵی ژینی پاش ئەم
دنیایە داناوە.
زانستی راستەقینەی هەر
بە ئیلهام و بە ئیشراق و بە وەحی و عیرفان زانیوە.

**بەڵام بەرەکەی رۆژئاوا**
**هەمیشە هەر لەناو خاکا بۆ بەختەوەری گەڕاوە.**
**هەمیشە هەر ویستوویەتی _ بەرئاوەژوو _**
**ئاسمان بکا بە زەوینی.**
**هەمیشە چرای رێنوێنی عەقڵی تەسکی مرۆو بووە.**

**جارێکیتر وورد بڕوانە لە لاپەڕەکانی مێژوو،**
**تا ئێسا بەمەت زانیبوو**
**کە زاگرۆس وەک مەتاڵێک* لە بەرد و پۆڵا**
**لە بەرەبەیانی مێژووەوە**
**رۆژهەڵاتی لە گەزەن* و سەدەمەی بەری رۆژئاوا پاراستووە؟**

**زانیبووت کە**
**رۆژهەڵات لە رووی راستیەوە**
**لانکەی شارستانیەت بووە و**
**هەموو زانستانی مرۆو**
**لە بەری رۆژهەڵاتەوە گوێزراوەتەوە بۆ ئەوبەر؟**

**زانیبووت کە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوین**
**وەکوو دەروازەیێک وایە**
**شەوژەنی* ئەم دەروازەیە نێر و مێیە**

نێرینەکەی زنجیرە کێوی زاگرۆسە و
مێیینەکەی بێروونەکانی* حیجاز و
دەشتەکانی فەلەستین و
ـ پێت سەیر نەبێ ئەگەر بڵێم ـ
نەرمانەکانی لێواری چۆمی نیلە؟

جارێکیتر تێ بفکرە،
ئەزانی کە پێغەمبەرانی مە ـ زنی خوداوەندی حەق تەعالا
لە ئیبراهیمەوە هەتاکوو
ئەگا بە مووسا و عیسا و محەممەد (د.)
هەموو هەر لەم ناوچەیەدا مەبعووس کران؟
ئەزانی کە ئەم ناوچەیە
کانگای* رۆحی رۆژهەڵاتە و سەرچاوەی دین؟

جارێکیتر بیر بکەوە،
ئەزانی کە بوونەوەرانی زەوینی
هەر کە تێر بوون
چاو سوور ئەکەن و درِ* ئەبن؛
پەلاماری ئەم و ئەو و یەکتر ئەدەن؟

**سەدەکانی ناوەڕاست بوو**
**کە دیسان بۆ جارێکیتر**
**بەری رۆژهەڵات کەوتە بەر**
**پەلاماری دڕندانەی داعبای* ئەوبەر**
**رۆڵەیێکی چیای زاگرۆس، سەلاحەددین،**
**رۆحی دینی بووژاندەوە و**
**چیای زاگرۆسی جۆش دا بە**
**دەشتەکانی فەلەستین و کەنارەکانی نیلەوە و**
**ئابەم جۆرە نێر و مێیەی**
**شەوژەنەکەی دەروازەی ناوێنی داخست.**
**کۆڵی نەدا**
**هەتاکوو دوژمن زەلیل بوو و هات بە چۆکدا.**

**دوژمنی دڕ* کە بە سەر شۆڕی گەڕاوە،**
**زانی بە گورگی پی ناکرێ بوو بە رێوی.**
**خۆی کرد بە تۆپیو و ئەوسا بە رێوی پێچ***
**هاتەوە بۆ پیلان گێڕان* و موڵ و مۆ*.**
**ئیتر هەر وا سەدە بە سەدە و چەرخ بە چەرخ**
**لە حەولا بوو**
**کە ئەم دەروازە پۆڵاینە**
**بنکۆڵ و رەهەندە بکا.**

هەر هاتەوە و هەر راو نرا.
هەر گەڕ* و پیلانی گێڕا و لە قاو درا.
بەڵام ئەفسووس
سێ پیلانی ئەم بەدفەڕە
ئەونە ئاڵۆز و بەسام بوون
کە جەرگی ناوچەی پیرۆزیان پێ شەقار بوو*.
ئەم سێ گەڕە
بوونەتە سێ گرێ پووچکە* و ناکرێنەوە.
پەنا بە خوا
بەم سێ گرێ باری خەڵکی ئەم ناوچەیە
یەکجار لار بوو.

یەکەم پیلان:
کۆڵەکەی گەورەی دەروازە رۆحی دین بوو؛
یەکەم هێرش کرایە سەر ئەم کۆڵەکە.
ئای لە رۆحی دین ئەترسان!
ئای دڵ پڕ بوون لە رێبەرانی ئایینی!
ئای شێخانی کاملی وارەستە* و
مەلایانی زانا و ووریا
چ چقڵێک بوون لە چاویانا!

ئای لە زانستی ئایینی چەن ئەترسان!
ئای پیرۆزی مەرقەدی شێخ
ئای ئیمام و ئیمامزادە
بار بوون بە سەر دڵیانەوە!
ئای تۆقیبوون لەم شەخسانە
کە مەرگ پیانی نەئەوێرا،
کە دوای مەرگیش هەر زینوو بوون،
قەبرەکەشیان هەر رێبەر بوو!
ئای کە جەرگیان بە فتوای جیهاد رزی بوو!
ئای لە خوێنی پیرۆزی حوسەین ئەترسان
کە لە پشتی چەند سەدەوە
وەکوو جەنگەی نیوەڕۆی عاشووڕا
هەر تازە بوو و هەر ئەجۆشی و هەر هەڵ ئەچوو!
ئای ئەلەرزین بە هەیبەتی شەهیدەکانی کەربەلا؛
بە هەیبەتی خوێنی خودا!...
ئەبوایە ئەم کۆڵەکە گەورەی دەروازە بڕمێنن*.
ئەبوایە دین لە رۆحی خۆی بەتاڵ بکەن.
ئەبوایە دین لە رێبەرانی دینی دا ـ بڕن.
ئەبوایە دین بگۆ ـ ڕن و هەر قاپووڕێکی* چڵکنی لێ بێڵنەوە.
ئەم کارە قەت بە هێرشی راستەوخۆ سەری نەئەگرت.
ئەم کارە قەت بە دەسی قەشە* و میسیۆنێر* پێش نەئەچوو.

ئەبوو دورڕەگێک* پەیدا کەن.
نەتبیستووە کە کورد ئەڵێ:
«دار کە هۆرەی لە خۆی نەبێ ناقەڵەشێ.»
هێنایان لە هەرچی هزر و باوەڕی زیددی ئایین بوو،
داهۆڵێکیان* لە شێوەی ئایین دروست کرد.
سۆزانێیکی بلّح و سەرەڕۆ و بێمێشکیان
لە دەشتی نەجدا دۆزیەوە و
لەو داهۆڵە چڵکنەیان مارە بڕی.
پاش ماوەیێک سۆزانی وەک دەڵ ترەکی و
وەهابیەت لە دا ـ یک بوو!
بەو جۆرە بوو کە بینای دین بەرئاوەژوو کرایەوە:
شێخ و مەلا کران بە دوژمنی دین و
سیخوڕانی* دەسەمۆی رۆژئاوایەکان
بوونە رێبەر.
زانستگەلی یەک هەزار ساڵەی ئیسلامی
بە مەنتیق و بە کەلام و بە حیکمەت و بە فیقە و بە عیرفانەوە
هەمووی یەکسەر بە بیدعەت لە قەڵەم درا.
ئاوەڕۆی عەقڵی زەمینی داعبا عەرزیەکەی رۆژئاوا
بۆ زانستی دین و ئایین بوو بە چرا.
ئیمام مالیک لەگەڵ ئیمام بووحەنیفە

**هەر وا ئیمامی شافیعی و ئیبنی حەنبەل**
**هەر چواریان بە کافر دەرچوون.**
**خوێنی شێعەش مەباح کرا.**
**شمر و یەزید بوون بە پیاوانی پیرۆز و**
**حوسەینی مەزڵووم خەتابار.**
**زیارەتی قەبری ئەولیا و ئیمامانی پاکی مەعسووم**
**ناوی نرا بوتپەرەستی.**
**تەماح و دنیا خوار ـ دن و تاڵانچێتی**
**هەر بە ناوی کەسپی حەڵاڵ**
**پارێزگاری* و زوهدی لە ریشە دەرهێنا.**
**پاک و راستی**
**جێی خۆی دا بە مەکر و غە ـ در.**
**نەشری دین لە جێی حیکمەت و پەندی چاک و موجادیلە**
**بوو بە سیخوڕی* و کوشت و بڕ**
**نهێنکاری* و تەقاندنەوە.**
**بەڵام جیهاد؟**
**ئەوە خۆشە کە بزانی ئەسڵی جیهاد چی بە سەر هات:**
**داگیرکەری رۆژئاوایی**
**بوون بە دۆست و بە پاڵ و پشتی دین.**
**فتوا دەرچوو:**
**«وەرن ئەوەڵ**

به یارمەتی ئەم دۆستانە
سەرپاکی کۆمەڵگای ئیسلام
کە ناپاک و بیدعەتگەر و بە تەفرەقەن
پامالْ ئەکەین و ئەکوژین.
خوێنی ژن و منداڵیشیان هەر مەباحە،
وورد و درشت ئەبێ پێکەوە سەربڕین.»
چی پێ نەچوو زۆریەتی ئەم دێوەزمەیە
بە یارمەتی دوژمنی دین
دەشتی حیجازیان داگیر کرد؛
دەسی زاڵیان خستە سەر عەرزی حەرەمەین.

دووهەم پیلان:
مەتاڵی بەردینی زاگرۆس دابەش کرا.
هەر بەشێکیان
بە تەنافی قەومپەرەستی
بەست بە ملی شێتێکەوە
ئیتر هەر وا مرخێش مرخێش رایانکێشا و رایانتەکان
هەتا یەکجار سست و سڕ بوو.
ئەگەر چی هەر وا بە ئاسان بەیدەس نەبوو* و کۆڵی نەدا.
گەرچی رۆحی سەلاحەددین هەر ئەهات و ئە ـ ژیاوە؛

**گەر چی شێخ مەحموودی نەمر**
**هات و ئەم رۆحە پیرۆزەی**
**لە شێخ عوبەیدیللا وەر گرت.**
**ئەگەر چی قازی محەمەد سەرچاوەی پیلانی ناسی و**
**بە گژ پیلانگێڕانا چوو.**
**بەڵام ئەفسووس تازە هیچیان**
**نەئەبوون بە سەلاحەددین.**
**هەتاکوو پاشان زاگرۆسیش**
**وورده وورده رۆحی دینی لە بیر کرد* و**
**فکری رەشی داعبا* عەرزیەکەی رۆژئاوا**
**چووە جەستەی.**
**ئیتر سەرگەردان و گێل بوو.**
**دۆس و دوژمنی لێ تێک چوو و**
**ئاسۆی رزگاری لێ لێڵ بوو.**

**سێهەم پیلان:**
**کە دەروازە شل بووەوە بە پیلانی* چەند سەد ساڵە،**
**هەوای هێرشی راستەوخۆ کەوتە سەری**
**بەڵام واش هەر نەیئەوێرا؛**
**ئەبوو دەمامکێک* لە سەر کا؛**
**دەمامکێکی رۆژهەڵاتی.**

ئەبوو جۆرێک بێتە کایە کە خۆیشی بێ و خۆیشی نەبێ.
ئەبوو ببێت بە داعبا*یێک
گورگیش بێت و رێویش بێت و سەگی هاریش.
ئەبوو دڕندە و خوێنڕێژ بێ و شێوە مەزڵووم.
ئەبوو رەنگی دِین لە خۆی هەڵساوێ و
دوژمنی سوێندخواردووی دین بێ؛
دوژمنی کینە لە دڵی دینی ئیسلام.

بۆ خولقاندنی ئەم دەعبایە*
هەموو کونج و کەلێنی مێژووی مرۆوی تەواو پشکاند.
هەموو گەڕ* و فێڵ و فریوی مێشکی خۆی بە کار هێنا.
لە یەک بە یەکی ئەزموونی شەڕ و کێشەی چەند سەد ساڵە
کەڵکی وەرگرت.
درگای لە سەر رق و کینەی کۆن و نوێی دڵی کردەوە.
پەنای بردە بەر ئیبلیس و یارمەتی خواست.
بەم جۆرە شەتڵی* شەیتانی سەهیۆنیسمی پەروەردە کرد،
هێنای و لە دەشتگەلی سەوز و بەپیتی فەلەستینا
ئەم شەتڵە* ناپاکەی چەقاند.
ئیتر هێرش لە دوای هێرش،
پەلامار لە سەر پەلامار،

**خوێنڕێژی و بە کۆ کوش ـ تن و**
**لە ماڵ و مەوتەن وەدەرنان.**
**ئیتر پیلان* لە دوای پیلان؛**
**زورنای پڕوپاگەندەی* ڕەش،**
**ڕەخنە کردنی مێشک و دڵ و**
**گۆڕین و هەڵگێڕانەوەی ڕاستیەکانی مێژووی ناوچە و**
**چاو بەس ـ تن و شەڕلاتانی و**
**تاڵان کردنی ماڵ و سامان...**

**سا بزانە**
**کلیلی ئەم سێ تەلیسمە**
**هەر لە گیرفانی تۆدایە؛**
**تۆ ئەڵێم ئەی ڕۆڵەی ئەمڕۆی چیای زاگرۆس!**
**تۆ ئەڵێم ئەی نەوەی نووێی سەلاحەددین!**
**ئێوە ئەڵێم ڕۆڵەکانی نەجد و حیجاز!**
**ڕۆڵەکانی قودسی پیرۆز!**
**ڕۆڵەکانی کەنارەکانی چۆمی نیل!**
**هەتاکوو ئەم سێ تەلیسمانە نەشکێنن**
**ڕزگاری بۆ ئێوە نابێ.**

**١٣٨٩/٢/٨**
**ڕەبەت**

## «آتش جهان‌سوز»

چه غوغـــایی درون جـــان ز تــب دارم
عجــــب دارم اگر جانی به لـــــب دارم

نصیبــم از دنـــــی دائـم  هلاهــل شـــد
به انبـــان گرچه دنیـــــائی رطـب دارم

نجـــــوید تا طبیــــب این بارم از علّت
جــهان سوز آتشی در جــان سبــب دارم

بپوســـد ماه رویـــت  یوســـف مغـموم
که بنـــد غـــم مـــحاقـــی پر تعب دارم

بنــــازم او که در گـــورم نه تنهـــا دیـد
من آن خــار مـم وزین را غضـــب دارم

نهــــاده بــر پـــــر عنقـــــا دل کـــجرو
ز دســــت دل دم و ساعت به شب دارم

از آن گــونه که دل بشکست وحشت‌ها
اگر جــــانی بــه لب دارم، عجــب دارم

بهار ۱۳۶۹
تهران

## «کاروانی»

زنی به شوقی دوان آمده،
در رخوت بیهودگی
تکیه‌زد
و گلاب جبین به آرامی
با انگشت شست
سترد.

مُنعِم کاروانی
با هزاران شتر بارگوهر
زانوی افلاس بر خاک بازار انداخت.

قناری دل شکسته
با سری افکنده در پیش،
گریز را

بشکافت سینه‌ی دشت‌های روشنایی.

شمعی در آفتاب ظهر
شعله می‌رقصانَد.

ای اسطوره‌ی عشق و زیبایی
به کدامین انتقام
این غربت را
آفریدی؟



یا کریم قلندر،
آواره‌ی سکوت سرد کیهان،
آنگاه که در جوار ستاره‌ای رهگذر
آواز غربت می‌دهد سر
ناله‌اش نشانی دارد تا فنا
از روزی که در دستانت آرمید
و زنگوله‌ای در حنجره‌اش بستی.

**هنوز قهقهه‌ی طفل دلم در گوش‌هایم می‌پیچد**
**آنگاه که بیهوش‌وار**
**تن لخت و تفتیده**
**به آب بازی فواره‌های نگاهت می‌سپرد.**

**به کدامین بها**
**این باغ نارس را**
**فروختی؟**

بهار ۱۳۶۹
تهران

**«دوبیتی»**

**گویـــــم به دلـــم از چـــه به شـــوری دمِ نـــــوروز**
**پــــرپــــر زند و لــــب گزد او با شَعَــــف و ســــــوز**
**یعنـــــی که امیــــدی چو یکــــی غنچـــــــه برآمد**
**تا چــون شــکفد، گــل چــه دهــد، کــی شود آن روز**

**زمستان ۱۳۷۰**

**تهران**

## «غصّه‌ی دریا»

**دختر دریا!**
**دختر قلّه‌های سبزپوش سر درمه!**
**دختر آسمان گریسته به چهار فصل شاد**
**همچون عاشق نورس آشفته!**

**دختر بادهای عرق‌ریز از تب اشتیاق نوازش!**
**دختر پرچین‌های گل بافته!**
**دختر مهر! دختر نازش!**

**دختر نسیم‌های ترد روح افزا،**
**پیک سرزمین‌های دورآفتابی!**
**دختر ساحل‌های جان‌پرور،**
**افق‌های بیکرانه‌ی آبی!**
**دختر قهرهای کاهنده،**

آشتی‌های پرفریب بی‌تابی!

دختر نگاههای مِه‌آلود ابربربام!
دختر شالی‌های بی‌خُدعه،
کوشش‌های کم‌طمع خوش فرجام!
دختر مقصود! دختر مرام!

می‌توانی تک درخت انبوه سبزی باشی
بر قلّه‌ی سنگی سرکش آرزوهایم آیا؟...

زمستان ۱۳۷۱
تهران

## «ای کاش ترا دیده بودم»

چگونه بودی
آهو بچه‌ی رموک پرخمارم
آنگاه که هلهله‌کنان و شلنگ انداز،
پاک و سرمست و بی‌خیر،
با آرزوهایی همچون همهمه‌ی امواج
در گرگ و میش ساحل،
با لذّت زندگی در ذائقه‌ات،
همچون طعم خامه‌های کردی و بوی سبزه
در صبحانه‌ی خنکای جوار جنگل،
می‌دویدی بر سبزه‌های انبوه
چون نگینی در حلقه‌ی دختران مدرسه؟

چگونه بودی؟

ای کاش دیده بودمت
آنگاه که در هاله‌ای روشن از غصّه و آرزو
چون مِه و آفتاب،
با انگشتان بلند شکننده‌ات در بافتنی،
به درّه‌های پرسایه‌ی جنگل می‌اندیشیدی!

ای کاش دیده بودمت
آنگاه که دور شدن پروانه‌گونه‌ات
موج‌های تلخ و شیرین دلواپسی را
به قلب مادرت می‌ریخت؛
گویی که امروز من بود!

ای کاش دیده بودمت
که در گوشه‌ی خلوت گمنامی،
دور از نگاه‌های خراشنده‌ی رقیبان
کودکی بیش نبودی!

***«فراسو»***

**بنگر که مرزها چه اندازه دورند؛**
**از روبرو، از پشت سر، از راست، از چپ،**
**از جانب محو آبی،**
**و حتی از فروسوی زَفت خاکینه.**
**نه به دوری اقصای مشرق،**
**نه تا حدود منتهای مغرب،**
**نه تا مرزهای متصوَّر کیهان،**
**تا مرزهای آرامش ابدی.**
**و چه بی‌نور است این منزل جزیره‌گون**
**با پیوندهای بی‌ثباتش دردل**
**چنان کلبه‌ای گلین تابیده در آن فروغی از روزنی**
**و ساحل آرامشش در ماوراء.**

**۱۳۷۹/۵/۷**

**قلندر**

## «*جلوه*»

می‌آیند.

کی وز کجا می‌آیند؟

از ورای زمان می‌آیند و

از آن سوی مکان؛

از پشت این پرده‌ی پنداری،

از سرچشمه‌ی نور ساطع نامیرا،

از بیکران فراگیر رشته‌ی خیالینه‌ای

که ظاهربینانش تکامل می‌نامند،

به یکسان در اعصار حجر و شتر و فضا وترمودینامیک،

در برهه‌ی مهندسی ژن‌ها

و سلطه‌ی مغزواره‌های بی‌جان و بی‌احساس می‌آیند.

بوده‌اند و هستند و خواهند بود

**هر دم و هرجا مدام.**

۱۳۷۹/۷/۷

**قلندر**

***«تحت نظر»***

**بر سر هر چهار راه چلدیده‌ای نهاده‌اند**
**از چشمان جهولی، از دوربین‌های ظلومی**
**و مسیر گام‌هایم را می جویند، قدم به قدم،**
**چین‌های پیشانیم را می‌شمارند، یک‌به‌یک،**
**حرکت لب‌ها و بر هم خوردن پلکهایم را به ثبت می‌رسانند،**
**موهای سروصورتم را سانت می‌زنند**
**و می‌کاوند و می‌سنجند هر آنچه را که از گلویم**
**فرو می‌رود و**
**از زبانم  بر می‌آید.**
**بر سر هر گذر آزمایشگاهی نهاده‌اند**
**تا زمانی چند باز دارندم و**
**به تماشایم بنشینند از نزدیک.**
**در کشاکش نفوس مظلم، در کش و قوس وقایع**
**هر ساعت از جانبی راهم را می‌زنند و**
**بر در و دیوارم می‌کوبند و**

به دار و بندم می‌کشند.

هستند کسانی که در وحشتند از وجود من،
هستند کسانی که در حیرتند از خلقت من،
هستند کسانی که حریصند به نعش من.
هستند کسانی که می‌جویند افتخار شکست من.
هستند کسانی که در عذابند از دیدار من.
هستند کسانی که در طمعند به افکار من،
هستند کسانی که به گمانند از طینت من،
هستند کسانی که دشمنند با طریق من،
هستند کسانی که بیزارند از سلوک من،
آهای ... خلایق! ...
من نیز فردیم از نوع شما
مرا چه گناهیست که باید
در کانون ذرّه‌بین‌های شما بسوزم،
در زیر میکروسکوپهای شما تجزیه شوم،
به آهنگ سازهای ناکوک شما برقصم،

در غل و زنجیر شما بپوسم؟
شما را چه شده‌است که مُصرّید
راز درون من را بدانید،
رمز خلقت من را بگشایید،
از نعشِ من تغذیه کنید؟
هان... اگر ذرّه‌ای از جوهر صدق با شماست هنوز
نیک گوش دارید تا خود بگویمتان:
از قرآن مجید بخوانید،
از کلام بلند خاتم انبیا برگیرید،
از نهج‌البلاغه‌ی عزیز تفسیر کنید،
مثنوی شریف را توّرق نمائید،
به دیوان مستور حافظ توّسل جویید،
از شیخ عطار نیشابوری و خواجه‌ی جام بپرسید،
به کمینه مریدان شاه طریقت گوش بسپارید.
چه غوغائی انگیخته‌اید که بدانید من چیستم؟
من «در پشت هیچستان»[۱] جای گزیده‌ام
و «خود به گمانم که هستم یا نیستم»[۲].

**آری آن زمان که شما پندارید هستم، هیچم**
**و آن دم هستم که در واقع نیستم.**

**۱۳۸۰/۱/۳۱**
**سقز**

---

۱- سهراب سپهری
۲- هیمن، شاعر بزرگ کرد

***«فسقلی»***

**نیستم انوری و خاقانی**
**که بُوَد حربه‌ی پرخاش کلامم.**
**من دریغم همه از پوست انسان است**
**که کشندش سرِ هر جانوری.**
**دَور می‌گردد از گودی و تاریش سرم،**
**به چنین چاهی که می‌نگرم.**
**از حقارت و حضیضِ بشرِ نوآیینست حَدیث ،**
**فهم کن تو سخنم.**

**می‌جوَدَ انبان انبان کُتُب او موش صفت،**
**بر سرش می‌نهد آنگه دستار پسرِ سینا**
**می‌برد فانوس جادو در دست،**
**باری از چشم بُوَد نابینا.**
**جانش از هر عطشی خالی و بی‌آرام**

می‌رود کوه به کوه از پیِ آب
که سقاییست بخیل او، نه زهابی پُرتاب.

دم زهجرت ز بیابان و غبارش بزند.
آرزویِ باران و نم و روییدن گل‌ها بکند.
واژه‌ها مظلومند و بی‌فریاد،
هر که خواهد بَرِشان ظلم کند.
چه بهاریست بیا و بنگر از نزدیک
تا رسی به بن و به اقطارش
نه خبر از رَهِش محرومان.
نه نشان از یکسانی.
نه بسوزد چون شمعی یکی آزاده.
نه به در آید کس از خود.
عشق و ایثار و تواضع مفقود.
آسمانی زَ بَر خاکش نیست.
شکم است و بعدش زیرشکم.
طمع است و نفع خویش همه غم

سهم هر کس قدر مکّاریش.
پوستینه مغزی پیشروانش همه نشخوارگران.
حاکمانش دو سه چون اویی گُربُز.
به زرنگی نازند ابدالش.
تا بدانی تو بهار او ز احوالش.
عجبا تخم آزادی کارد
بی‌سرو بن هوسی که
طپش و مالیخولیای حقیقت‌جویی
به دلش راه ندارد.

پیر سیمرغ صفت، عطّار روشن را
که به جز قاف حصاری نشناخت افکارش،
سَلَف خود کند و بازان
چینه‌های کوتاه نیشابور
حِجرِ دنیای حقیر و بی‌بوی اوست.

ورد من _گوید گستاخ_ سرودِ سرخی است اَنالحق‌گونه

**لیک بدتر ز همه شحنگکان**
**در میان رمه‌ی ماموران معذور**
**قصد حلّاجان صافی امروز کند**
**که حضور ایشان را، که وجود ایشان را**
**سند افشای خود می‌بیند.**
**تو بگو این که اناالحقّش خواند،**
**ز حسینش بشماریم، ز نمرودش یا فرعون؟**

**ز تبار رندانِ بی‌پروا**
**خواجه حافظ را حتیّ**
**افتخار شاگردی ندهد،**
**چه تماشاییست آن وقت**
**خرقه‌ی زهد و سالوس و ریاکاری نو**
**به تنش بو می‌گیرد.**
**ژست‌های متعفّن می‌ریزد ز سراپایش.**
**ادب و فلسفه و عرفان بفروشد با نخوت**
**اندر آن جرگه‌ی دانشجویان،**

حلقه‌هایی ز مریدانِ نادار بصر،
و نهد منّت بر نسل بشر.

سرّ مانائی سعدی را تفسیر کند.
که عبادت به جز از خدمت مردم نیست.
راز والائی مولانا را شرح دهد
که رهایی در ترکِ دَنی دون است و
ملکوت اعلا را زیر پر آوردن
و پیِ بوق‌نوازانیست
که شعاری که دهد در آثارش
همه را جار زنند.
عجب آثاری! اینش بس!
و زبونانه گدایی بکند شهرت را
نزد هر ناکس و کس.

شیخ نورانی مِهنه که قدم بر سر افلاک نهاد و
ماسوا در نظرش جیفه‌ی بوناکی بود،

**وز تواضع پشه دانستی خود را،**
**دست ناپاک او ملعبه‌ای کردش**
**از برای به نمایش درآوردن امیال پلیدش**
**که فلان جا با آن مرکز عالم گردد**
**و چون اوها، ز حقارت سقطان، پیشرو و راهنما،**
**که ز وارستگی و فرهنگِ خویش بگوید.**
**زلف پخشان بُوَد و فیزِ و افاده وَ لباس چرکین**
**آنچه دریافته‌اند امثالِ او هیهات!**
**ز بزرگانی چون شیخ.**
**این مرید شیخ میهنه باشد**
**که بساید تیغ عربده بر هر کس**
**شمّه‌ای از لجن و ناکسی و جهل ورا بازنماید؟**
**که بلرزند فقیر و مظلومان**
**ز دسیسه‌گری و مکر و فریبش؟**

**با حماسه و نوای پر شورِ استاد طوس**
**گرم می‌گردد گویا، سرِ او**

**و به کُردان، خلف صدق دلیران ایرانشهر**
**که سلحشوریِ گودرز و وفاداریِ زنگه،**
**فرّه و بُرز سیاووش و کیخسرو**
**می تراود از سیماشان،**
**می‌نماید نیش.**
**می‌کند قصد سر ایشان را**
**و دل ایشان سازد سخنانش ریش.**
**گو ز شهنامه بخوان**
**مرز آزاده کجا را گویند**
**و فلان جا چه قدَر ارزش داشت.**
**نظری بر تاریخ انداز**
**که که بنیاد نهاد ایران را**
**و که پاسش داشت.**
**نه هم اکنون به فلان جا حاضر هستند**
**آن دلیران نژاده از کُردان**
**که برای حفظ اجداد تو**
**ز نهیب ترک و افغان‌ها آمده‌اند؟!**

**وه که احساس حقارت چه نمودی دارد**
**و چه اندازه شگفت و پیچیده است!**

**پیرو مارکس می‌داند خود را.**
**چه نمی‌گویم از اخلاق کارگری**
**و همین بس که به یک وهّابی**
**_ دیده‌ام من_ ز سرِ دوراندیشی**
**نان همی داد به قرض**
**که بدان حفظ منافع**
**نزد او باشد فرض.**

**الغرض می‌طلبم من ز همه اقمارش**
**که بگویند: "مرام او چیست و هدف اطوارش؟"**
**برجهد، نیش زند، ناله و غوغا بکند،**
**بسراید، بنویسد، بچخد، زار زند.**
**کرم لای کتب و بی‌خبر از هر عیشی،**
**قفسی در بر او خرقه‌ی روشنفکری،**

معترض، ناخرسند از همه خلقانِ معاصر،
متکبّر، متعفّن، متظاهر.
کُنه گفتارش گویم، چه غمم:
"من منم، تا که نگویید کمم!"
و چنین باشد برده که مدرن و نو باشد.

۱۳۸٤/۳/۱۹

ربط

## ***«فریاد»***

**من کجایم؟**
**جمع کفّار قریش است این**
**یا که دشت صفّین؟**
**کربلا یا**
**جبهه‌ی نفت‌شهر؟**
**بیت اعلای نبوّت در چه سویی است؟**
**خیمه‌ی پاک امامت را می‌گویم،**
**جایگاه رهبر،**
**سنگر فرماندهی کلّ؟**

**سخنی دارم،**
**پیغامی عاجل،**
**چیزهایی که فقط من می‌توانم گفت.**
**بشتابید خدا را،**

ساعتی دیگر قرآنها
بر سر نیزه خواهد رفت.
ساعتی دیگر لشکر ابن زیاد
می‌رسد از راه.
ساعتی دیگر دشمن تک خواهد زد.
از چه روی مرا درنمی‌یابد کس؟
خودیانند یا دشمن
اینان که من می‌بینم؟
چه قَدَر غافل می‌نمایند، چه گیج!
نه نه! نه غافلند و نه گیج،
مکر دشمن سنگین است.
حیله‌ی صد هزاران عمرو عاص
محو می‌گردد در این مکّاری.
خوی خونریز هزار ابن زیاد
رنگ می‌بازد در این سخت‌دلی.
همه جوّ زمین از دسیسه آگنده است.
چه هیولائیست استعمار!

**چه پلید است صهیونیسم!**
**این خودِ ابلیس است!**
**خون من لوث خواهد شد آیا**
**و نخواهد رسید پیغام من؟**
**از چه روی چنین شد؟**
**من چرا تنها افتادم؟**
**زچه بازماندم از صفِ یاران؟**
**دیر از خواب برخاستم**
**یا که گم کردم راه را؟**
**ای خوشا آنان که شتافتند از پیش،**
**آن جماعتِ ساده‌ی یک‌دل**
**با جبین‌های نورانی**
**و سینه‌های سرخ؛**
**السّابقون السّابقون!**

**کس صدای مرا نمی‌شنود؟**
**چه قَدَر دردمندم من و چه اندازه مظلوم!**

چه قَدَر تنهایم و خونین!
من گریسته‌ام سال‌ها در دهانه‌ی چاه.
تجربه کرده‌ام ظهر عاشورا را.
بنگرید به چهره‌ی من
که نشان از جوشش خاموش شب‌های خلوت دارد
و ببینید سَرِ زانوهای من را
کز جدال با صخره‌های سخت پینه بسته است.
ز چه رو دیر رسیدم؟
راه من دشوار بود آری.
هان کجایند یاران طبیعی من،
آن جماعتِ ساده‌ی یکرنگ؟
هیچ دوستی صدای من را نمی‌شنود خدا را؟
به مقرّ فرماندهیم راه نمائید؛
خیمه‌ی پاک امامت را می‌گویم،
بیت رهبر.
هان بگویید که شکایتی دارم،
سخنی بی‌مانند،

آنچنان حرفی که فقط من می‌توانم گفت،
پیغامی عاجل.

بگویید ابوذر است تنها افتاده،
خسته از ضربِ سرانِ قریش،
زانکه یکبار در حالتِ مستی
نام محمد را فریاد زده است
در جوار کعبه.

بگویید حسّان آمده است،
بگرفته در زیر بغل دیوانش،
جَرَیان دارد بر محاسنش اشکی.
ترسم از آن است، می‌گوید، که بعد از من
سر به نیست کنند دیوانم
و بگردانند اشعارم را.

بگویید مجاهدی آمده است روشن جان،

می‌گوید
دیده‌ام من مجلسِ رایزنیِ
عمرو عاص را با اربابش.
ساعتی دیگر قرآنها
بر سَرِ نیزه خواهد رفت.

بگویید فردی بی نام و نشان
زاهالی کوفه آمده است،
می‌گوید
من می‌دانم چه گذشت بر مسلم.
من خبر از جنبشِ لشکر ابن زیاد آورده‌ام.

بگویید یک بسیجیِ پیر
از جبهه‌ی غرب آمده است،
می‌گوید
نقشه‌یِ تک دشمن را خوانده‌ام من.
می‌گوید

در پسِ جبهه نفوذ کرده است دشمن.

ای خدا را ز چه روی کس نمی‌شَـنَـود حرف مرا؟
به هم آمیخته است صفها.
مشکل شده تشخیص دوست از دشمن.
چه هیولائیست استعمار!
چه پلید است صهیونیسم!
همه جوّ زمین از دسیسه آگنده است!
چه فجیع است حالِ من!
پیغام مرا خاموش خواهند کرد
و خون من را لوث!
خدا را راهم بنمائید به خیمه‌ی امامت،
جایگاه فرماندهی را می‌گویم،
بیت مطهّرِ ولایت.
من شکایتی دارم بگویید،
پیغامی عاجل.
من را دریابید پیش از آنکه دیر شود.

سخنِ من را بشَــنَــوید
پیش از آنکه مرا از دست دهید.
ای شگفتا از من،
چه بزرگم من و چه سرخم!

بگویید حسین بن منصور حلاّج است،
می‌گوید
پیش از آنکه خاکسترِ مرا به باد دهید،
بگذارید بر سرِ مناره‌های شهر
آوازی بخوانم،
سرودی سرخ،
کلامی کوتاه.
بگذارید فریاد بزنم:
«چه بزرگ‌مردی بودی خمینی
که توانستی
به زانو درآوری
دیو هزار چهره‌ی استعمار را؛

که توانستی

بشکنی طلسم‌های تو بر توی صهیونیسم!»

۱۳۸۹/۲/۲۲

ربط

## «زستان»[١]

**سڵاوی گەرم و پڕهەستت وەڵام نادەن،**
**گ سەر شۆڕی ملیوانە.**
**کەسێ ناتوانێ سەر هەڵببڕێ بۆ جوابدانەوە و دیداری ئازیزان،**
**نیگا بەرپێ نەبێ جێیێک بەدی ناکا،**
**تەمە و ڕێگا خلیسکانە.**
**ئەگەر دەستی ئەوینداری ئەدەیتە کەس،**
**بەلالووتی لە باخەڵ دەستی دەردێنێ؛**
**کزەی سەرماکە پڕژانە.**
**هەناسەت گەرمەگەرمی سینە جێدێڵێ ئەبێتە مژ، ڕەش و تاریک،**
**وەکوو دیوارێ هەڵئەکشێ بە بەر چاوتا.**
**هەناسەی خۆت کە وابێ، دەی چیە هیوات**
**بەکرداری هەواڵانی نزیک یان دوور؟**
□
**مەسیحای دڵ فراوانی من، ئەی پیری خوداترسی کەوا چڵکن!**
**هەوا چەند دڵڕەقانە تۆف و بەندە، ئای ...!**

سەرت خۆش و سلامەت بێت،
سلاوم تۆ وەلام دە، بیکەوە درگات.
منم من، مێ ـ همانی هە ر شەوی تۆ، شەنگەکەی خەمبار!
منم من، بەردی ئازاری شەقان کێشاو،
منم، ناتۆری* پیسی عالەمی خولقان، هەوای ناباو*.
نەرۆمیم* نەقولە زەنگم*،
ئەوی بێڕەنگی بێڕەنگم.
وەرە دەرکە وەکە، وەیکە دە، دلتەنگم.
حەریفێ، خانەخوێ! میوانی مانگ و سالەکانت وا
چو بینی ئاو ئەلەرزێ* لە بەری درگا
نە تاوی تەرزەیە و نە مەرگ،
ئەگەر دەنگێک ئەبیسی تۆ،
ووت و وێژی ددانە و تۆف.
من ئەمشەو هاتو- وم تا قەرزەکەت دانێم.
حەسابت لای جامە تەرزەکەت دانێم.
چما* ئێژی درەنگانە، بەیان بەربوو، گزینگیدا؟!
فریوی داوی ئەوسووریەی لە ئاسمان دیارە، پێت وایە ئەوە خۆرە.
حەریفی خۆم، ئەوە گوێیێکی سەرمابردووە و نەخشاوی زللەی ساردی زستانە.
چرادانی بەر ئاسۆی تەسکی مەیدان، مردوو یان زینوو،

لە ناو تابووتی ئەستووری شەوی نۆتۆی لە مەرگ پێچراوە
پەنهانە.
حەریفێ دابڕۆ هەڵکە چرای بادە، شەو و ڕۆژ بۆ مە یەکسانە.
□
سڵاوی گەرم و پڕهەستت وەڵام نادەن.
هەوا دڵتەنگ، دەرکان کپ،
گ سەر شۆڕی ملیوان
دەست لە تویێی گیرفان
هەناسە مژ، دڵان مانوو بە خەم گێژن
درەختگەل پەیکەر ئێسکێکن* بلوورئاژن
زەوی دڵمردە، ئاسمان میچێ نزم و کورت
هەتاو و مانگ تەمیان گرت
چ زستانێ!

زستانی ١٣٦٦
تاران

---

١ لە "مێهدی ئەخەوان سالیس"، شاعیری هاوچەرخی فارس.

## «چلچلی»[1]

من لەو واتا* رووتە* گەڕاوم
پا بەپای هەتاوێگی بێکەڵک
که ئەیپێوم
بە پێوانەی ڕۆژەکانی خۆم کە لە کاسە دارێنەی گولان ئەچێ.
من لەو واتا رووتە
گەڕاوم.
من لەو واتا رووتە ئەگەڕێم.

پێوانە بە چل گەیشت و لەویش تێپەڕی،
ئەفسانەگەلی سەرگەردانیت
-ئەی دڵی دەربەدەر!-
لە ئاکامی* خۆی نزیک ئەبێتەوە.

بێهوودە مەرگ
بەهەڕەشە
چاو دائەپچڕێ.
ئێمە ملمان بە راستەقینە بوونی
کاتژمێرەکانا نەکردووە

به پای ئەم رەنجانە نەبێ
کە لە ئەوینە رەنگینەکانی ئادەمیزادان
بەرمان کەوتووە؛
وەک بیرەوەرییێک هەرکامی
درکێندراو
لە نووکی خنجێرێ
لە لای دارێ.

با ئەوەش تۆ لە بیر مەکە
کە ئێمە
-من و تۆ-
مرۆومان
ریعایەت کردووە.
(با شاکاری
خودا بووبێ
یان نەبووبێ) و

ئەوینمان
ریعایەت کردووە.
□
لە بارانا و بە شەو

**لە بن گوێچکەکانی ئێمە**
**لە مەودایێکی کورتی خەونوێنی رووسووری ئێمەدا**
**سۆزانیەکان**
**بۆ نیشان دانی لە ئارادا بوونی خۆیان**
**هەوا کۆنەکان**
**بە فیتوو**
**ئەژەنن.**
**(لەبەرانبەر کام رووداوا**
**ئاخۆ**
**مرۆوت**
**دیوە**
**بە عارەقی شەرمەوە**
**لە سەر هەنیەی؟)**

□

**ئەو دەمەی کە لەخت و لاری هەرە* رێک و پێک بە دراوێک**
**ئەکرێ بکڕی.**

**من**
**-داخم ئەی داخ –**
**ئەو کاتەی هەوە جێم***
**ئەکەوێتە**
**کیمیای ئەوین.**

هەر ئەو دەمەیە.
هەر ئەو دەمەیە.
□
دڵم لە ناو مجرییێکی کۆنا
ئەشارمەوە
لە دیوێکا کە دەربیجەییێکی
نیە.

لە ساباتەوە*
بە رووی کۆڵانی تاریکا
دادێمەوە و
لە باتی گشت ناهومێدان
بە کوڵ ئەگریم.

ئاخ
من
لە کیس چو ـ وم!
□
با ئەوەش – ئەی دڵی دەربەدەر!–
لە بیر مەکە
کە ئێمە

- منو تو –
ئەوینمان ریعایەت کردووە،

لە بیر مەکە
که ئێمه
-من و تۆ-
مرۆومان
ریعایەت کردووە،
با شاکاری خودا بووبێ
یان نەبووبێ.

۱۳۷۰/۱/۱۲
تاران

---

۱ لە "ئەحمەد شاملو"، شاعیری هاوچەرخی فارس.

## «قسەی تازە»[١]

هـا کـە قسـەی تـازە بـکە تـا دوو جیـهان تـازە ئـەبێ
دەرئەچێ لە حـەددی جیـهان، بێحـەد و ئەندازە ئـەبێ

خاکی رەشـی بەسـەر ئـەوەی کە بە قسـەت تازە نەبـوو
یان کـە تـەواو ئەبێتـە رەنـگ یـان قسە و ئـاوازە ئەبـێ

ئـەوەی بـووە ئاڵقـەیی دەر، خێـرا ئەبـا هـۆقەیـی زەڕ
تایبەت ئەگەر دەرکـە وەکەی، مەحـرەمی دەروازە ئـەبـێ

ئـاو لـە کـوێ ئەیـزانـی ئەبێ بە گـەوهـەری زمانڕەوان
خـاک لە کـوێ ئەیـزانی کـە بە غـەمزەیی غەممازە ئەبێ

رووی کەسێ سوور نەبوو بەبێ سـوورایەتی لـەعلی لەبت
بێتۆ ئەگەر سـوور بێ، بە هـۆی سـوورایەتی غازە ئەبێ

ووشتـری ساڵـح کە ئـەبـوو لـە رەوەزی کێـوی، زانیـم
کێـو لـە بـۆ مزگێنـی ئـەتـۆ ووشتـری جەممـازە ئەبـێ

سڕ بپۆشە و مـەتەق مەکە، ئەگەرچی زۆر سەختە سکووت

**ئەوەی هــەوەڵ جــگەرســـۆزە ، پاشێ جــگەرســازە ئەبــێ**

**١٣٨٣/١٢/١٢**

**رەبەت**

---

١ لە "دیوان غزلیات شمس" (مولانا جلال‌الدین رومی بلخی)

مانای ووشەکان:

ئاوازە: ناوبانگ، لێرەدا بە مانای قسەی ڕووت و بێ‌ناوەرۆکە

هۆقە: کووپەڵەیێکی چکۆڵە کە زێڕیان تێ‌ئەکرد، (حقّە)

زەڕ: زێڕ، تەڵا

گەوهەری زمان‌رەوان: مەبەست «نەفسی زمان‌زان»، یان«نفس‌ناطقە»یە.

لەبت: لێوت

غازە: سووراو

رەوەز: گاشەبەردی پاڵ کێو، (صخرە)

جەممازە: ووشتری تیژڕەو

## «ئاكامی جوانی»[1]

هەر کە جوانی خۆی خستــە سەر مــەزات
ســـــەد قەزا و ســـەد بەڵا رووی تێ ئەکات

چـــاوی خێــس و قیــنی تێــژ و ئێرەیــی
دێ بەســـەریــا قەڵبەزەی بێبـــــەزەیـــی

دوژمـــنـــان لـــــەبـــەر بـــەغیـــلی ئـــەیبـــڕن
دۆستـــانیـــش کـــات و ســـاتی ئـــە ـ گـــرن

خۆت بخەیتە بەر پەنـــای هەق جا ئـــەبێ
ئەو هەزاران لوتف و رەحمـــی بۆت ئـــەبێ

تا پەنـــات تـــۆ دەس کەوێـــت و چۆن پەنا
ئـــاو و ئـــاورت ببنـــە پێشمـــــەرگ و سپا

ئەی بۆ دەریا بۆ مووسا و نۆح نەبوە یار؟
دوژمـــنـــانـــی بـــۆ نـــەکـــردن تـــار و مـــار؟

بـــۆ بــــرایـــم ئـــاوورێ نـــەبـــووە قـــــەڵا؟

**تــاکوو نمــروود جــەرگی یەکجار داتوڵا؟**

**کێــوێ یەحیــای بانگ نەکرد بێتە پەنای؟**
**دایە بەر بەرد ئەو کەسانەی کەوتنە دوای؟**

**پــیئەڵــێ: "یەحیــا بــەرەو مــن ڕابــکە**
**تــا پەنــات بـــم من لـە جەنگ و مــارەکە"**

**۱۳۸٤/۲/۹**
**ڕەبەت**

---

۱ لە **"مثنوی"** (مولانا جلال‌الدین‌رومی بلخی)

مانای ووشەکان:

مە زات: هەڕاج

ئێرەیی: بەغیلی، (حسادت)

تارو مارکردن: بەربڵاوکردن، تێکشکاندن

قەڵبەزە: لێشاوی ئاو، شەپۆلی توند

داتوڵا: دارژا، هەلاهەلا بوو

(١)

مــن چــیم ســەگی بــیلالم یــا مووحەممــەد
لــە عیشــقی تــۆ هــیلالم* یــا مووحەممــەد
مــەدحی تــۆ مەگــەر خــودا بیکــا هــەر بــۆ خــۆی
نــەک مــن کــە زمــان لاڵــم یــا مووحەممــەد

٨٤/٧/٢٥

***

(٢)

ئــــالۆز و پەرێشــــانم یــــا مووحەممــــەد
بەنــدی دەســی شــەیتانم یــا مووحەممــەد
تیشــکی رێنووێنیــت بخــە ســەر رێــی تــارم*
رزگــــار بکــــە ئیمــــانم یــــا مووحەممــــەد

٨٤/٧/٢٥

***

(٣)

فــەرمووی نــووری چــاوی منــە نــوێژ، مووحەممــەد
هــەر نــوێژی ئــەکرد شــەوی درێــژ مووحەممــەد
بــڕوای بــەوە بــوو غەفڵــەت و نــوێژ دواخســتن
ئینســانی موسوڵــمان ئــەکا گێــژ، مووحەممــەد

٨٤/٧/٢٧

***

(٤)

بــــەرگی گولّـــی عـــەرش، روخســـاری مووحەممــــەد
بـــــاخی جەننــــــەت، دیـــــــداری مووحەممـــــەد
دەریاییێکــــە لـــــە حیکمــــەت و پەنـــد و نەســـیحەت
گشــــــت ئـــــەخبار و ئاکـــــاری* مووحەممـــــەد
٨٤/٤/٧/٢٢

***

(٥)

خوایــــــە بمکــــە بــــە بولبــــولی مووحەممـــــەد
بـــا هــــەر بخـــوێنم بـــۆ گولّـــی مووحەممـــەد
ســــۆزێ بـــدە بــــە دەنـــگ و ســــەدای خــــەمبارم
بـــا دەر ببـــــڕم ســــۆز و کولّــــی مووحەممــــەد
٨٤/٨/١٠

***

(٦)

پلــــلاری* قـــــوڕەیش بـــا مــــنی گرتبـــا محەمـــەد
ئامـــانجی گـــەدە* بـــا ســـەری مـــن بـــا محەمـــەد
نــــازدارێکی وەک تـــۆ ببینـــێ ســـارد و ســـــووکی
قەلّـــغانی* بەلّــــات بـــام، ئـــەرێ، بریـــا محەمـــەد
٨٥/٨/١١

***

(٧)

مەكتـــەب كـــە نـــەچوو و نەيـــدی مامۆســـتا محەمـــەد
ســـیرڕی ووجـــودی مـــۆم بـــوو لـــە دەســـتا محەمـــەد
گیـــانم بـــە فیـــدای، گـــەرچی ئـــۆمی بـــوو، مـــەکاتب
پـــاک لـــە حـــوزووری نـــەزان راوێســـتا محەمـــەد

٨٥/٨/١٦

***

(٨)

دیانـــت کـــە شـــەهید بـــوو لـــە ئوحـــود دا محەمـــەد
دیـــان نـــا، کۆڵـــەکەی عیشـــق بـــوو کـــە رووخـــا محەمـــەد
حەققـــە هەڵـــی کێشـــم وەکـــوو وەیـــس ســـیو دوو د-یـــان
بـــۆ جـــەورێ لـــە پـــای ئێمـــەت کێشـــا محەمـــەد

٨٥/٨/١١

***

(٩)

بـــوورڕاقی بـــۆ پـــای عەرشـــێ کـــە تـــاو دا محەمـــەد
عیشـــقی ئـــەزەلی یـــاری لـــە قـــاو دا محەمـــەد
موڵـــکی دوو جیهـــانی هاتـــە ڕێ لـــە چـــەپ و راســـت
نـــەی دی جگـــە یـــار، چشـــتێ* لـــە نـــاو دا محەمـــەد

٨٥/٨/١٥

***

(١٠)

کەوتوومەتـــــە بەنـــــدی دنیـــــا یـــــا محەمـــــەد
بەنـــــدی هـــــەوەس و بەنـــــدی هـــــەوا یـــــا محەمـــــەد
زاڵ بـــــوو نەفســـــی کـــــافری مـــــن بـــــە ســـــەرما
فریـــــام بکـــــەوی، ئـــــاخ، خۆزگـــــا یـــــا محەمـــــەد

٨٤/٧/٢٦

***

(١١)

هیـــــوام نیـــــە مـــــن هـــــیچ بـــــە عەمـــــەل یـــــا محەمـــــەد
ئـــــەکرێ لـــــە عەمـــــەل قەڵـــــب* و دەغـــــەڵ* یـــــا محەمـــــەد
دڵ خۆشـــــی ئـــــەوەم ئوممـــــەتی تـــــۆم و تـــــۆ شـــــەفیع
فریـــــام بکـــــەوە کـــــاتی ئەجـــــەل یـــــا محەمـــــەد

٨٤/٨/٢٤

***

(١٢)

لـــــەولاکی* خەڵـــــات کـــــرد بـــــەکێ؟ تـــــەنیا محەمـــــەد
هـــــۆی خیلقەتـــــە بـــــۆ ئـــــادەم و حـــــەووا محەمـــــەد
نـــــوح و ئیبراهـــــیم و مووســـــا و عیســـــا
گشـــــت هـــــەر وەکـــــوو رووبـــــارن و دەریـــــا محەمـــــەد

٨٤/٧/٢٥

***

(١٣)

گــــوێ بگـــــره لـــــه ئافـــاق* دێ هـــــه‌رای یــــا محه‌مـــــه‌د
هێمنیـــــت گه‌ره‌کـــــه بگـــــره ســــه‌رای* یــــا محه‌مــــه‌د
چه‌رخێکـــــــه دزێــــــو* و گـــــــه‌لێ تاریـــــک و تنـــــۆک
بــــۆ دیتــــــنی ڕێ هه‌ڵــــکه چــــرای یــــا محه‌مــــه‌د

٨٥/٨/٧

***

(١٤)

ســــــووتام بـــــه خــــــودا مـــــن لـــــه فیراقـــــت محه‌مــــه‌د
جیهـــــان چ چۆڵــــــه بـــــه هـــــۆی مــــه‌راقت* محه‌مـــــه‌د
ته‌ســــــکینم ئــــــه‌دا ئـــــــاواتی دیـــــــداری قیامــــــه‌ت
کۆتـــــا کــــــه لــــــه‌وێ هیجـــــرانی شـــــاقت محه‌مــــــه‌د

١٢ /٨٥/٨

***

(١٥)

لــه دایـک کـه بـوو، بـوت گشـت بـه ڕوودا کـه‌وت محه‌مـه‌د
ئاوورگـــه لـــه گـــڕ کـــه‌وت، ســـه‌ری ده‌رکـــه‌وت محه‌مـــه‌د
شـــــه‌ق بــــوو تـــــاقی هــــــه‌یوانی ئه‌نه‌وشــــیروان شـــــا
یـــــانی ســــــته‌م و کــــــوفر شـــــکا، ســــــه‌رکه‌وت محه‌مـــــه‌د

٨٥/٨/١٦

***

(١٦)

بـــە کۆشـــش و خـــۆڕاگری ســـەرکەوت محەمـــەد
بـــە زەبـــری خـــەبات پـــەیغامی دەرکـــەوت محەمـــەد
رەنـــج دان و لـــە خـــۆ بـــووردن بـــۆ دیـــن مەرجـــە
ئاســـان نـــەبوو کـــە ســـەروەری بەرکـــەوت محەمـــەد

٨٥/٨/١١

***

(١٧)

ســـەودایی* تـــۆ چـــی داوە لـــە جەننـــەت؟ محەمـــەد
مەقســـوود کـــە تـــۆ بی، ئاســـانە میحنـــەت محەمـــەد
دەردی ئـــەتۆ ناگۆڕمـــەوە بـــە ســـەد دەرمـــان
دەرمـــان کـــە نـــا، دەردم بکـــە قســـمەت محەمـــەد

٨٥/٨/١٤

***

(١٨)

دابەشکـــەرە بـــۆ ئـــاوی کەوســـەر محەمـــەد
پاکانـــە ئـــەکا* رۆژی مەحشـــەر محەمـــەد
غافـــل مەبـــە لـــە هیممـــەتی بـــێ ئەنـــدازەی
بگـــرە* بگـــۆڕێ تـــالیع* و ئەختـــەر* محەمـــەد

٨٤/٧/٢٥

***

(١٩)

نـــەک هـــەر مـــنی عـــەودالّ* لـــە کەمەنـــدام محەمـــەد
جیهـــان ســـەفی عاشـــقە لـــە دەر و بـــام* محەمـــەد
جیـــنن و ئینســـان و مەلـــەک ســـەودا ســـەرن*
غـــەمزەت چ دەبـــێ گـــەر بـــدا پـــێن* کـــام* محەمـــەد؟
٨٥/٨/١٣

***

(٢٠)

ســـککەی بێبـــەهای قەڵـــبە* ووجـــوودم محەمـــەد
لـــە دەرکـــی خـــودا زۆر بـــێ نمـــوودم* محەمـــەد
لـــە کـــوێی کـــە بـــە کیمیـــای* نیگایـــێ بمکەیـــە زێـــڕ؟
ئـــاوری عینایـــەت پـــێم بگـــاعوودم* محەمـــەد
٨٥/٨/١٢

***

(٢١)

چـــیم مـــن؟ چۆلەکـــەی ووردی زەبـــوونم محەمـــەد
پاســـارە* هێلانـــەم، گـــەلێ دوونم* محەمـــەد
ســـیمورغی ئـــەتۆ، پـــێش کـــەوە، بمبـــە بـــۆ قـــاف
بـــا ســـەنگی* نـــەبێ دان لـــە دەروونم محەمـــەد
٨٥/٨/١٤

***

(٢٢)

مانــــــای هــــــەموو شــــێعر و گــــــۆرانیم محەمــــــەد
ئامــــــــانجی رۆحــــــــی یـــــــەزدانیم محەمـــــــەد
هەوســــــاری هەســــت و فکــــر و ســــۆ -زمـــی گـــرت
کۆتاکـــــــەری گشــــــت ســــــەرگەردانیم مەحمــــــەد

٨٤/٧/٢٦

***

(٢٣)

دیـــــنی کـــــاملّ کـــــردوە بــــە قورئـــــان محەمـــــەد
زۆری پـــــــەڕ و بـــــــالّ داوە بەئینســــــان محەمــــــەد
هــــــەرچی کــــە نەخۆشـــی دلّ و خەوشــــی* رۆحــــە
پــــاکی بــــە زیکــــر کــــردووە دەرمــــان محەمــــەد

٨٤/٧/٢٧

***

(٢٤)

خوازیـــــاری هـــــەبوو هـــــەر بـــــە هـــــەزاران محەمـــــەد
کــــەمیان بـــۆ وی بـــوون، راســـتی، بە یـــاران محەمـــەد
مووجاهیـــــــد و مووبـــــــاریز و پارێزگاریـــــــان*
ناگرێتـــــە پـــــەنای خـــــۆی گزیکـــــاران* محەمـــــەد

٨٤/٨/٩

***

(٢٥)

زۆر داویە گرینگی بە هەژاران محەمەد
چاکە بە بێگانە و کەس و کاران محەمەد
هەر کەس کە وەسەر یەک بنێ ماڵ، بێ بەخشین
لێی کردووە لەعنەت بە هەزاران محەمەد

٨٤/٨/٨

***

(٢٦)

ڕۆچنەی نووری یەزدانە بۆ جیهان محەمەد
ڕێنوێنی ئەکا سەرپاکی ئینسان محەمەد
کاروانسەراییکە کۆن ئەم گەردوونە
گشت ئەنبیا میوان، ساحێب خوان محەمەد

٨٤/٧/٢٥

***

(٢٧)

بۆیێ ئەخەوم، بێتە خەوی من محەمەد
تیفتیفە* بدا بە دڵی چڵکن محەمەد
گۆشە نیگایێ بخاتە سەر ئەحواڵم
بە شکوو خەفەتم هەڵ کەنی لە بن محەمەد

٨٤/٧/٢٣

***

(۲۸)

هـــــاوڕازی دەروون و یـــــاری دێـــــرین محەمـــــەد
هـــــەوری فرەبـــــاری بـــــەهاری ژیـــــن محەمـــــەد
دینێکـــــی هێنایـــــە گـــــۆڕێ بـــــۆ نەسڵـــــی مـــــرۆو
نەســـخی* هـــەموو چەشـــنی دیـــن و ئـــایین محەمـــەد
۸٥/۸/۷

***

(۲۹)

خاکینـــــە ووبـــــێ‌پـــــۆز و دەمـــــار* بـــــوو محەمـــــەد
ڕێـــزی ئـــەنا لـــە هـــەرچی هـــەژار بـــوو محەمـــەد
بـــۆ حـــیلم و ســـە-بـــر کێـــوێکی یـــەکجار بـــەرز بـــوو
ڕاســـتڕەو بـــوو لەگـــەڵ هەرکـــە کـــە لار بـــوو محەمـــەد
۸٥/۸/۱۰

***

(۳۰)

ئاگـــــای لـــــە کـــــار و کردارتـــــە محەمـــــەد
گـــەر تـــۆ بـــۆ ئـــەو بی، خەمخوارتـــە محەمـــەد
تـــف کـــە لـــە مـــەڕامی کـــوڕی عەبـــدولوەهاب
داشـــداری* بکـــەی ســـەخت داشـــدارتە محەمـــەد
۸٤/۷/۲٦

***

(٣١)

حوببی شەدیدە، نووری دوو دیدە، محەمەد
ریشەی دڵی کێشام لە نەدیدە، محەمەد
ئارامی دڵی من، هەموو سۆز و کوڵی من
نێڵی*دا کڵی* من، بە عەقیدە، محەمەد

٨٥/٨/١٢

***

(٣٢)

من خاسە کەوم، شەهێن و بازە محەمەد
من زار و زەبوون و گەلێ سازە محەمەد
چبکەم بە چ فێڵی بکەوم لە داوی
بمباتەوە بۆ ناو دەروازە محەمەد

٨٤/٧/٢٣

***

(٣٣)

من بولبول و باخی بەسەفایە محەمەد
من تینووم و ئاوی بەقایە* محەمەد
قەت ناهومێدم ناکا لە دۆستی خۆی
بەدیهێنەری خواستی گەدایە محەمەد

٨٤/٨/١٠

***

(٣٤)

پێشـــــەنگ و شـــــاهی ئەنبیایـــــە محەمـــــەد
تـــــەعلیمدەری خێڵـــــی ئەولیایـــــە محەمـــــەد
مـــــیر و مـــــەزنی پـــــاکی مـــــەخلووقی خـــــودا
ســـــەفوەت لـــــە ســـــیفاتی ئەســـــفیایە محەمـــــەد

٨٤/٧/٢٣

***

(٣٥)

رێبـــــەر بـــــۆ گـــــەلی جیـــــنن و مرۆیـــــە محەمـــــەد
راســـــت بێـــــژە، نـــــەهیی لـــــە درۆیـــــە محەمـــــەد
هـــــەر چەشـــــنە گرفتـــــێ هەیـــــە، بیهێنـــــە دەری
تەئکیـــــد فـــــەرەجی* موشـــــکلی تۆیـــــە محەمـــــەد

٨٥/٨/١٠

***

(٣٦)

پاکـــــانن و چاکـــــان ئـــــەولادی محەمـــــەد
دایم ئـــــەتۆ یادیـــــان کـــــە بـــــە یـــــادی محەمـــــەد
لـــــە فاتمـــــە ڕا تـــــا حەســـــەنی عەســـــکەری بـــــێ
شـــــادی ئەوانـــــە باعیســـــی شـــــادی محەمـــــەد

٨٤/٧/٢٦

***

(٣٧)

کــــردی کاتـــێ دۆســـت عـــەزمی دیــــداری محەمـــەد
مـــەنزل قـــابی قەوســـەین بـــوو بـــۆ بـــاری محەمـــەد
بـــێ نـــاز لـــەوێ کـــەوتن نـــەبییان بـــێ دڵ و هـــۆش
جیبریـــل ســـەری ســـوورِ مـــا بـــوو لـــە کـــاری محەمـــەد

٨٥/٨/١٥

***

(٣٨)

گوڵـــــزاری مەدینە، ئـــــەی شـــــاری محەمـــــەد
وا پـــــەڕ دەرئەکـــــەم بـــــۆ دیـــــداری محەمـــــەد
کـــەی بـــێم گـــوێ بگـــرم لـــە ســـیرەی باڵـــی مەلـــەک؟
کـــــەی تێـــــر ببیـــــنم مـــــن یادگـــــاری محەمـــــەد؟

٨٤/٧/٢٩

***

(٣٩)

غـــاری حیـــڕا بـــۆن خۆشـــە لـــە عـــەتری محەمـــەد
هـــــەوری حیجـــازێ بوونەتـــــە چـــــەتری محەمـــــەد
مەککـــــە و مەدینـــــە پـــــڕ نـــــووره چونکـــــوو لەوێنـــــە
بـــۆی هـــاتووه وەحـــی ســـەتر* بـــە ســـەتری محەمـــەد

٨٥/٨/٧

***

(٤٠)

قورئـــــانی کەریمـــــە ئیعجـــــازی محەمـــــەد
رزگـــاری لـــە ئافـــەت هـــەموو نیـــازی* محەمـــەد
نـــەفس و شـــەیتانی جـــن و ئینســـن دوژمـــن
تێـــک ناشـــکێ هـــەرگیز ســـەربازی محەمـــەد
٨٤/٧/٢٨

***

(٤١)

هـــــەتوانی* بریـنانـــــە جەماڵـــــی محەمـــــەد
کەشـــتی رێـــی رزگارییـــە ئـــالی محەمـــەد
پرســـــینەوە نابـــــێ لـــــە رۆژی قیامـــــەت
بـــۆ عاشـــق و خولیـــا و عەوداڵـــی* محەمـــەد
٨٤/٧/٢٣

***

(٤٢)

عالـــەم ئـــەکا پـــاک مـــەدحی کەماڵـــی محەمـــەد
هـــۆی ســـەوزی رۆحـــە وەســـفی جەماڵـــی محەمـــەد
پادشـــایی جیهـــان بـــە هـــیچ دێتـــە بـــەر نـــەزەری
ســـەودا ســـەر* و خولیـــا* و عـــە وداڵـــی* محەمـــەد
٨٥/٨/١٠

***

(٤٣)

وەک گوڵشەنە*، با سەفا، کەلامی محەمەد
خۆشبەختی مرۆوانە مەڕامی محەمەد
ئەی دڵ تۆ ئەگەر قە-درشناسی تێ بگە
شاهی هەموو شاهانە غولامی محەمەد

٨٤/٧/٢٦

***

(٤٤)

لە ناو گەلی کورد بوومە حەسانی* محەمەد
بو تیغی غەزا بوومە هەسانی محەمەد
بەشکوو محەمەد سیلەی نیگایێ* با بە کورد
مەیدانی غەزا بگرێ بەسانی* محەمەد

٨٥/٨/١٥

***

(٤٥)

لەم دنیا ئەژیم بە چەن و چۆنی محەمەد
لە حەشر ڕائەبم بە عیشقی کۆنی محەمەد
پاشی هەزاران ساڵ ئەگە وەیکەن گۆڕەکەم
هێشتا لە خاکم هەڵ ئەسێ بۆنی محەمەد

٨٥/٨/١٣

***

(٤٦)

پڕســــــۆز و بتاوێنــــــه ئـــــەوینی محەمــــــەد
یـــــەکجار مــــەتین و مەحکەمـــــە دیـــــنی محەمــــەد
ســــەر دا ئەنـــــەوێنن بـــــۆ تــــۆ ئـــــەربابی عـــــەقڵ
گـــــەر دەســــت بدەیــــە حــــەبلی مــــەتینی محەمــــەد

٨٥/٨/١١

***

(٤٧)

مەســــــتم بــــــە بــــــادەی ســــافی ئـــــەوینی محەمــــەد
ڕۆح دەرئــــــەچوو خۆزگــــــە لــــــە ســــــەرینی* محەمــــەد
لــــــە ڕۆژی حەشـــــــر نەعرەتــــــەیێکم لــــــێ ئـــــــەدا
ســــــەحرام ئەشــــێوان مــــــن بــــــە بینیــــــنی محەمــــەد

٨٥/٨/١٣

***

(٤٨)

هــــــەرگیز نــــــەبوو بــــــە بــــێ بــــــزە لێــــــوی محەمــــەد
دایم گــــــەش بــــــوو ڕووی وەکــــــوو ســــــێوی محەمــــەد
قەتقــــــەت نەهاتــــــە ســــــەردەمی گفــــــتی ناحــــــەز
بــــــۆنی ئــــــەدەب و ڕێــــــز دێ لــــــە نێــــــوی محەمــــەد

٨٨٥/١٠

***

(٤٩)

مانــگ شــەق بــوو بــە ئیشــارەی پــەنجــەی محەمــەد
جیبریـــل بـــە جـــێ مـــا کـــاتی لەنجـــەی محەمـــەد
کـــافری دامـــاو کـــرد لـــە پەرەســـتنی گ بوتـــێ
بۆیـــە بـــە کۆمـــەڵ ئـــەدەن شـــکەنجەی محەمـــەد
٨٤/٧/٢٦

***

(٥٠)

کێیـــە محەمـــەد وا عالـــەم ئێـــژێ محـــە مـــەد
عالـــەم ئەســـووتێ، نمـــێ نـــەڕێژێ محەمـــەد
گـــەردوون بەدەنـــە و ڕۆحـــە محەممـــەد بـــە مەســـەل
ڕۆحـــی نیـــە، خۆشـــی نـــەوێ، گێـــژێ محەمـــەد
٨٥/٨/١٤

***

(٥١)

هـــەرچی هەیـــە لـــەم گەردوونـــە ئێـــژێ محەمـــەد
بـــۆوەی لـــە کـــەماڵ پێـــی بـــدا چێـــژێ* محەمـــەد
هـــەر بوونـــەوەرێ یـــەک کۆڵـــەکەی حەننانەیـــە*
جێـــی هێشـــتووە لـــە لاقـــەدی لێـــژێ محەمـــەد
٨٥/٨/٧

***

(٥٢)

نابــــــڕدریٚ بـــــۆ مــــــن پـــــەرژینیٚ محەمــــــەد
کاڵـــــم، مـــــەدەدم بکـــــە بـــــە تینـــــیٚ محەمــــــەد
ناشـــــارەزام و ریٚگـــــە گـــــەلیٚ پـــــڕ کـــــەن و کۆســـــپ
دەســــــتم بــــــدە دەســــــت ســــیڕاجەدینیٚ محەمــــــەد

٨٥/٨/١٥

***

# فەرهەنگۆک

(سەرنج : ئەو واژە و ئیستیلاحانەی کە لێرەدا مانا کراونەتەوە، لە ناو دەقی شێعرەکانا بە نیشانەی * دیاری کراون. ئەوەی لە مانا کردنەوەدا لە ناو نیشانەی ( ) دا هاتووە، مانای فارسی یان عەرەبی واژەکانە.)

## ئــ

**ئاتەگ** (٦٨): شاقەل، تەختەیێک لە داوێنی کەوای شۆڕ و باڵتە
**ئاژوان** (٢٠٥، ١٧٧): وە جەرەیان کەوتن، وە ڕێ کەوتن، ڕۆیشتن
**ئاژواندن** (١٩٠): وە گەڕ خستن، وە ڕێ خستن
**ئافاق** (٢٨٨): ئاسۆکان، وڵاتەکان
**ئاکار** (٢٨٥، ٥٤): ١- کردەوە، ئەخلاق و ڕەفتار، ٢- پاودان، ڕەوشت. ئەڵێن: «لەو ئاکارە تۆ پارە خەرج کەی، تا ئێوارە هیچت بە دەسەوە نامێنێ.» (نمط، نسق)
**ئاکام** (٢٧٠، ٧٩): ئەنجام، دوایی، کۆتایی، نەتیجە
**ئاڵ** (٧٢، ٥١): سوور
**ئان و ساتی** (٢٠٥): زوو تێپەڕ، بێدەوام
**ئاودز کردن** (١٠١): ئاو کێشان و چڵک کردنی برین
**ئاوونگ** (٧٣): شەونم
**ئاوەز سووتێن** (١٧٢): شتێکی کە عەقڵی پیاو لە بەین ببا. «ئاوەز»: عەقڵ
**ئاوی بەقا** (٢٩٠): ئاوی ژیان، ئاوی حەیات، ئاوێکی کە هەر کەس لی بخواتەوە قەت نامرێ
**ئاویەر** (١٣٨): ئابیدەر، ناوی شاخیکە لە پشت شاری سنە کە ئەڕوانێ بە سەر شارا

ئاهۆ (١٧٣، ١٣٠): پەتا، نەخۆشی گیرۆ، نەخۆشییێکی کە لە ناو خەڵکا ئەتەنێتەوە

ئاهەنگ (١١٨): (مراسم)

ئایەرە (٥١): ئامرازی پێوانە کردن، (پیمانە)

ئەجەل هەڵتی گرتووە (١٠٨): کاتی مەرگت هاتووە و گەرەکتە خۆت بە کوشت بدەی

ئەختەر (٢٨٩): ١- ئەسێرە، ٢- بەخت و ئێقباڵ، چارەنووس

ئەغیار (١٥٢): هۆشیار، لە سەر خۆ، کەسێ کە مەست و بێهۆش نەبێ

ئەفراسیاو (٧٥): بە پای گێڕانەوەکانی شانامەی فیردەوسی پادشای وولاتی توووران بووە کە لە رۆژهەلاتی ئێران هەلکەوتووە و دوژمنی ئێران بووە.

ئەفسوون (١٩٧): سێحر، جادوو

ئەنتیکە (٢٤): عەنتیکە، شتی کەونینە و گرانبایی کە هی رۆژگارانی زۆر کۆنە و زیاتر لە ژێر خاکا ئەدۆزرێتەوە. (عتیقە)

ئەندازیار (٢٢): (مهندس)

ئەنوا (١٦٢): سامان و دارایی، پاڵ و پشتی ژیان، «بێئەنوا»: بێنەوا، نەدار و بێسامان، بێبەش لە ئیمکاناتی ژیان

ئەوک (٨٤): گەروو، قوڕقوڕاچکە

ئەهوورا (٩٢): ئەهوورا مەزدا، خودای گەورە لە ئایینی زەردەشتیدا

ئەیان (١٨٠): ئاشکرا، سوور، عەیان. (عیان، آشکار)

ئیکسیر (١٧٨): کیمیا، شتێکی کە پێشێنیان لی ئەگەڕان و پیان وابوو کانزا بێ-قیمەتەکان ئەکا بە زێڕ و زێو.

ئێرەیی (١٨١، ٦٣): بەغیلی، حەسوودی

ئێسک سووک (٧٤): خوێن شیرین، رەزا سووک، لە دڵەوە نزیک

## ب

باژێڕ (٤٥): بازاڕ

باشار کردن (٢٠١): دە رۆست هاتن، دەرەقەت هاتن

باو (١٨٨): شتێ یان نەریتێ کە لە ناو خەڵکا برەوی ببێ. (مرسوم، رسم رایج)
بایەقوش (١٠١): کوند، کونەبوو. (جغد)
بریان (٤٤): برژاو، گۆشتی برژاو
بڕبەند (٦٤): ئامرازی ئاسن ڕنین. (سوهان)
بڕەم بڕەم (١٦٩): سیمڕ سیمڕ، مرخێش مرخێش
بزاو (٢٠٢، ١٠٣، ٧٨): جووڵە، حەرەکە
بزڕ (١٥٤، ٧٢): گوم، وون
بزۆز (٣٢): بێئارام، شەیتان، هار، شلووق. زیاتر بۆ منداڵ بە کار ئەبرێ.
بژوێن (٩١ ): زەمەند، زەوی پڕ گیا و لەوەڕ
بگرە... (٢٨٩): تەنانەت لەوانەیە...
بلیمەت (١٨١، ٥٦، ٢٣): مرۆوی زۆر خاوەن بەهرە و ئیستیعداد، نابیغە
بڵا (٤٦): بلا، با، دەبا، لێگەڕێ
بڵاڵووک (٢٣): ئاڵووباڵوو
بڵماندن (٢٧): بۆڵە بۆڵ کردن وەک دەنگی وورچ
بڵێسە (١١٨، ٨١، ٤٣): گڕی ئاوور، (شعلۀ آتش)
بناغە (١٩، ١٨): بنیاد، بنیات، پایە
بنوو (١٢٥): بخەوە
بنەبڕ (٤٨، ٣٩): لە ریشە دەرهاتوو، لە ناو چوو، فەوتاو. بنەبڕ بوونی مەزرا و دارستان مەبەست لە ناو چوون و فەوتانی لق بە لقی گیا و دارەکانیەتی.
بوورە (٢٢): زەوییێکی کە قەت نەکێڵدرابێ و کشت و کاڵی تیا نەکرابێ
بۆتە (١١٢): پیاڵەییێکی قوڕینە بووە کە زێڕیان تیا قاڵ کردووە بۆ تاقی کردنەوە و دەرخستنی خەوش و خاڵەکەی بۆیە بۆتە وەک مەحەک بە مەعنای ئامرازی تاقی کردنەوەیە.
بۆرە (١٢٤): پیاوی بێ ناونیشان، پیاوی ئاسایی. بۆرە و کەڵە (٤٥): پیاوی بێ ناونیشان و پیاوی سەر بە دەرەوە (عام و خاص)

**بۆرە پیاو** (١٠٢): **پیاوی بێ ناونیشان و بێ هونەر و ئاسایی. «بۆر» بۆ شتی ئاسایی و بێ نرخ بە کار ئەبرێ وەک ئەڵێن: «بۆرە خوڵکێکی کردم.» یانی خوڵکێکی ناتەواو و نابەدڵ.**

**بۆشایی** (١٩٨): **(فضا)**

**بۆنی شیرت لە زاری دێ** (١٠٨): **هێشتا زۆر منالی**

**بەبری بەیان** (١٠٧): **خەفتانی تایبەتی رۆستەم، بەرگێکی تایبەت کە رۆستەم بۆ شەڕ لە بەری کردووە و بە تەواوی مەعلووم نیە کە چی بووە. هێندێ کەس ئەڵێن لە بەهەشتەوە بۆی هاتووە. یەکجار مەحکەم بووە و شیر و تیر کاری لێ نەکردووە.**

**بە پارێز** (١١٨، ٤٤): **بە ئیحتیات. «پارێز» یانی خۆ دوور گرتن و خۆ لادان.**

**بە پۆز** (١٨٣): **بەدەمار، خۆ بە گەورە زان. (متکبّر)**

**بە تەووژم** (١٦٣): **بە زەخت، بە تەئسیر.** (شدید)

**بەدەعیە** (١٢١): **بەپۆز، بەدەمار**

**بەر** (٥٤): **بەهرە، میوە، حاسڵ**

**بەر بەرۆچکە** (٨٧): **بەر خۆرەتاو**

**بەربەرەکانێ** (١٧٨، ١٦٦): **لە رووا وێسان، بە گژا چوون، خەبات لەگەڵ کردن، مل لە بەر مل نان**

**بەرتەری** (١٨٠): **لە پێشتر بوون، لایەقتر بوون.** (برتری)

**بەرجەوەن** (٢٠٤، ١٩٢): **دیمەن، روانگە. ئەڵێن: «ئەم ماڵە بەرجەوەن خۆشە» یانی کە لەم ماڵەوە ئەڕوانی بۆ دەور و بەر دیمەن و روانگەی بەر چاوت جوان و خۆشە.** (منظر)

**بەردەزەرد هەتا...** (٧١): **ئەمانە ناوی کێوەکانی دەور و بەری شاری بۆکانن**

**بەرفرە** (٦٢): **بەرپان، بەرین،**

**بەرگری لێ کردن** (١٧٤): **پێش لێ گرتن، رێگە گرتن لە بڵاو بوونە و رەواجی شتێک یان روودان و ئەنجام گرتنی کارێک. ئێسا بووەتە باو کە ئەم واژەیە بە مانای دیفاع لێ کردن و لە سەر کردنەوە و داکۆکی لێ کردن بە کار دێنن. بێ-**

گومان ئەمە هەڵەیێکی یەکجار زەق و دزێوە و پێچەوانەی مانای راستەقینەی واژەکەیە.
بەرە بەرە (٦٧): وورده وورده، (بە تدریج)
بەرین (١١٨، ٥٧، ٣٣): پان، بەرپان، هەراو، فرەوان
بە زەبری کلک ئێسک شکاندن (١٦٦): لەم مەسەلە کوردیە وەرگیراوە کە ئەڵێن: «سەگ بە زەبری کلکی ئێسقان ئەشکێنێ.» ئەم مەسەلە بۆ کەسێکی خوێڕی و بێدەسەڵات بە کار دێنن کە بە پشتیوانی کەسێکیتر کارێک ئەکا.
بە سانی (٢٩٨): وەکوو، بە وێنەی
بەستە (١٨٠): گۆرانی، سروود
بەستەڵەک (٨١): سەهۆڵبەندان
بەستێن (٢٠٤): تەختی دەرە کە چۆمی پیا ئەڕوا؛ پانایێ کە کارێکی لە سەر روو ئەدا، زەمینە. (بستر، زمینە)
بەسەزمانی (٥٣): بێدەسەڵاتی، فەقیری، بێئازاری
بەشەوارە (٤٠): بە شەوارە کەوتوو، «بە شەوارە کەوتن»: ئەوەیە کە مەل لە تاریکی شەوا بە دینی شەوقی چرا هەڵفڕێ و دەرباز بێ. مەلی بە شەوارە کەوتوو چون لە تاریکیا رێ دەر ناکا ئەکەوێ.
بە فەڕ (١١٢): بە شکۆ
بەکڕ (١٢٨): مریشکێک کە لە سەر هێلکە ئەکەوێ، بە کورک
بە کەوان (٣٣): ئاڵقە ئاڵقە، بە چڕی.
بەلەسە (٩٥): تەرە، ئەگەر ئاژەڵێک لە بەر ترسان و تۆقین لە ران دوور کەوێتەوە و ئاوارە بێ، ئەڵێن بەلەسە بوو.
بەها (٥٤): بایی، قیمەت
بەیار (٦٢، ٢٢): بایەر، بایێر، باهێر، کێڵگەیێکی کە پێشتر کشت و کاڵی تیا کراوە بەڵام ئێسا کشت و کاڵی تیا ناکرێ و بێکەڵک ماوەوتەوە.
بەیدەس بوون (٢٢٦): پێمل بوون، خۆ بە دەسەوە دان، تەسلیم بوون
بەینەت (٥٠): پەیمان، عەهد

بیبیجان (١٤٩، ٨٦): کەسایەتییێکی بووکە شانۆی قەدیمی کوردی، لە زووا لۆتیە گەڕۆکەکان لە کوردستان بووکە شانۆییێکیان بە رێوە ئەبرد کە پیان ئەووت «پاڵەوان کەچەڵ و بیبیجان خانم». (یک شخصیت نمایش عروسکی سنتی کردی)

بێئاوەزی (٥١): بێعەقڵی، «ئاوەز»: عەقڵ

بێبوار (٦٢): بێ رێگەی گوزەر، بێرێگەی پەڕینەوە، «بوار»: شوێنێک لە ئاووا کە پیاوی تیا نوقم نەبێ و بۆ پەڕینەوە دەس بدا

بێپارێز (١٠٥): بێ ئیحتیات. بڕوانە «پارێز»

بێپێز (٦٢): شل و خۆ ڕانەگر، بۆ بەرگ و پارچە بە واتای تەنک و سووک و کەم جرمە.

بێتەگبیر (٥٣): شتی گۆترەیی و بەهەڵکەوت، شتێکی کە بە ووردی فکری لێ نەکرابێتەوە و پلان و نەخشەی بۆ دانەنرابێ، «تەگبیر»: ١- ڕا گۆڕینەوە، ٢ - چارەسازی کردن بۆ کار. (تدبیر)

بێچوون (٨٠): بێوێنە، بێمانەند

بێخەوش (٤٣): خالیس، پاک، ساف. (ناب، بیغش)

بێدەمار (٢٩٣): بێپۆز، خۆ بە زل نەزان. (متواضع)

بێروون (٢٢٠، ٢٠٢، ١٧٧، ٢٧): چۆڵ و بیابان، دەشتی قاقڕ و زیخەڵان و زۆر بەرین، (بیابان)

بێسەنگ (١٨٧): بێنرخ، سووک، بێئەرزش

بێشە (٣٨): دارستانی چڕ، بە تایبەت بە دارستانێک ئەڵێن کە خۆرسک بێ و دەسچێن نەبێ، جەنگەڵ.

بێعەجمان (١٠٢): بێقەرار، بێئارام. عەجمان: قەرار و ئارام

بێنموود (٢٩٠): بێسەنگ، بێنرخ، شتێکی کە لە بەر بێنرخی بەر چاو نایێ

بێنمەک (١٦٥): سپڵە، پێنەزان، ناسپاس

بێنەوا (٥٥): بێئەنوا، فەقیر، هەژار، ڕەجاڵ

## پ

**پاراو** (٧٢): **تێراو ، گیای پاراو گەش و تورتە.بڕوانە «تورت»**
**پارێز** (٤٤): **خۆ دوور گرتن و خۆ بواردن و لێ لادان ، توخون نەکەوتن.**
**پارێزگاری** (٢٢٥): **کردەوە و ئەخلاقی پارێزگار. بڕوانە «پارێزگار»**
**پارێزگار** (٢٩١): **خاوەن تەقوا ، کەسێکی کە لە گوناه و خراپە خۆی ئەپارێزێ و خۆی لائەدا**
**پاسا** (١٣١): **پاسا دان ، هۆ هێنانەوە بۆ گوناه و خەتا.** (توجیە)
**پاسار** (٢٩٠): **لێواری سەربان ، لە زووا کە زۆربەی خانووەکان لە گڵ دروست ئەکران چێوی قوڵە قوڵەیان لە لێواری بان ئەدا و لەگەڵ بانەکە سەریان ئەگرت بۆ ئەوەی ئاو بە دێواری خانووەکەدا نەیێتە خوارەوە. بەو ریزە چێوەیان ئەووت چێوپاسار کە چۆلەکە هێلانەی تیا ئەکرد. هەر لەبەر ئەمەش بوو کە بە چۆلەکەیان ئەووت پاساری.**
**پاکانە** (٥٤): **تۆمەت لابردن ،** (تبرئە)
**پرزۆڵ پرزۆڵ** (١٠٩): **وورد وورد. پڕزۆڵ: لەتی زۆر وورد**
**پرسۆ** (٥١): **پڕئێش ، پڕژان**
**پڕوپاگەندە** (٢٢٩): **راگەیاندن.** (تبلیغات)
**پزووسک** (١٧٦): **پریشکی  ووردی ئاوور کە لە کاتی سووتانی ئاوورا بە دەوران دەورا ئەپەڕێ.** (شرارە)
**پلار** (٥١): **پلار ، بڕوانە پلار**
**پلار** (٢٨٥): **دارێ یان شتێکیتر کە لە دورەوە لە کەسێ یان شتێکی هەڵ ئەکەن و پیا ئەدەن.**
**پۆلوو** (١٧٦): **سکڵ.** (ذغال گداختە، اخگر)
**پەپۆکە خواردن** (١١٩): **ئاڵقە بەستنی مار ، چەمەرە بەستنی مار**
**پەچە** (٤٠): **رووبەند**
**پەچە** (١٤٩): **شوێنی خەواندنی رانە مەڕ لە دەشت و کێو**
**پەرت** (٤٦): **بێ خەبەر ، کەسێکی کە پێویستە ئاگای لە شتێک بێ کەچی ئاگای لی نیە و تی ناگا.**

پەرستنگە (٤٤): جێگای تایبەتی پەرستن و عیبادەت کردن. (مَعبَد)
پەرۆش (٥٧): خەم و خەفەت و پەرێشانی
پەرەم پەرەم (١٠٧): برە برە، پارچە پارچە
پەسەند (٢١٤): پەسەند دان، پیا هەڵ ووتن (ستایش، ثنا، مدح)
پەسیو (١٥٤، ٥٣): شوێنکی کە رێگای هات و چووی بە سەرەوە نەبێ، گۆشە و کەنار
پەل هەڵ خستن (١١٨): بڵاو بوونەوە و لەوەڕانی هێمن و ئاسوودەی ئاژەڵ لە دەشت و کێوا
پەناپسکێ (١٨١): بۆ پەنا گەڕان، خۆ بۆ پەنا کوتان
پەنگاو (٤٠): ئاوی گەڕاوە، ئاوێک کە بە هۆی بەر گیرانەوە گەڕابێتەوە و کۆ بووبێتەوە.
پەیکەر ئێسک (٢٧٢): ئێسکی یەکپارچەی بەدەن، ئێسکی سەر تا پای لەش. (اسکلت)
پیرۆزەیی(٢١٤، ٨١): رەنگی شینی گەش. (فیروزەای)
پیرۆزە (١٣١): بەردێکی شینی بەقیمەتە کە بۆ رازاندنەوە کەڵکی لێ وەر ئەگیرێ، لێرەدا مەبەست رەنگی پیرۆزەییە، رەنگی شینی گەش، رەنگی ئاسمانی
پیلان (٢٢٨، ٢١٨): گەڵاڵە رشتن بۆ کاری خراپ، کەڵەک ساز کردن، داو نانەوە بۆ خەڵکی، گەڕ. (توطئە)
پیلان گێڕان (٢٢١): گەڵاڵە کێشان بۆ کاری خراپ، بە نهێنی عەلەیهی خەڵکی کارێک کردن. (توطئە کردن)
پێ بە جەرگی خۆدا نان (١١٩): زات وە بەر خۆ نان، زاڵ بوون بە سەر ترسی خۆدا
پێدا نووسان (٣٤): بە تامەزرۆیی و تاسەوە لێو چەسپاندن بە شتێکەوە بۆ ماچ کردن یان ئاو لێ خواردنەوە. وەک ئەڵێن: «بە دەسما نووسا، دەسمی ماچ کرد.» یان: «بەو شەربەدا نووسا تێری ئاو لێ خواردەوە.»
پێستی بگوروون (٩٦): پێستی داماڵن، پێستی دەرهێنن. بڕوانە «گوروون»

**پێکان** (١٧٧، ٥٢): **لە هەدەف دانی گوللە و تیر و خنجێر و شتی وا**
**پێن** (٢٩٠): **پێمان** (بن زاراوەی سەردەشتی)
**پێوان** (٣٨): **تەی کردن، بڕین.** «**کوێستانم... پێواوە» یانی کوێستانم تەی کردووە، کوێستانم بڕیوە**
**پێوە نووسان** (٦٦): **لەگەڵ گونجان، لەگەڵ حاوانەوە**
.

## ت

**تا** (٤٧): **لنگە بار، هاوسەنگ،** «**تای ئەو بکا**»: **وەک ئەو بێتەوە، هاوسەنگی ئەو بێ.**
**تابشت** (٥٦): **تاقەت، خۆڕاگری**
**تاپۆ** (٢٠٤): **تارمایی، ڕەشایی لە دوورەوە.** (شبح)
**تاتکەم دێ** (١٨٣): **لە بەر کزی و بێحاڵی لەش و سەرم ئەلەقێ**
**تار** (٢٨٤، ١٦٤، ٦٣، ٣٨): **تاریک**
**تارمایی** (٢٠٥): **تاپۆ، ڕەشایی لە دوورەوە.** (شبح)
**تاسە** (٧١): **ئارەزوو بە دڵ مان، ئاوات و ئارەزووی بە دی نەهاتوو.** «**تاسە**» **لە** «**تاسان**»**ەوە هاتووە کە بە مانای پشوو بڕان و خنکانە.** «**تاساندن**»**یش بە مانای خنکاندنە. واژەیتریش هەن کە لەم چاوگە دابڕاون، وەک ئەڵێن:** «**کابرا کە ئەو خەبەرەی بیست هەتا قەدەرێکی چاک لە تاسەوە چوو و هەناسەی پیا نەهاتەوە.**» **یانی پشووی سوار بوو، پشووی بڕا. یان ئەڵێن:** «**کاتێ چاوم بەو شتە کەوت، تاسێ بە سەرما هات، تا قەدەرێکی چاک هۆشم لای خۆم نەما.**» **کە وایە** «**تاسە**» **خەم و خەفەتی بە ئارەزوو و بە ئاوات نەگەیشتنە و وەک هێندێ کەس ووتوویانە بە مانای** «**ئارەزوو**» **و** «**ئیشتیاق** (**ئارەزووی سەخت**)» **نیە. ئەڵبەت دیارە کەسێک کە تاسەباری شتێک بێ هەمیشە ئارەزوو و ئیشتیاقی گەیشتن بەو شتەی لە دڵایە بەڵام هەموو ئاوات و ئارەزووێک تاسە نیە چونکە ئاوات و ئارەزووی وا هەیە کە مرۆو ئومێدی ماوە پی بگا و هێشتا نەبووە بە**

تاسه. تاسه ئاوات و ئارەزوویێکه که مرۆو ئومێدی نەماوه پی بگا. که وایه رەوا نیه که «تاسه» به ئارەزوو و ئیشتیاق مانا بکرێتەوه. «تاسه» پڕ به پڕ به مانای «حسرت»ی عەرەبی و فارسیه و لام وایه «عەزرەت»یش که به مانای تاسەیه هەر له «حسرت»ەوه هاتووه.

تاف (٢٠٤، ٦٥، ٤٣): هەڕەت، جەنگه. (موسم، عنفوان)

تالیع (٢٨٩): بەخت و ئیقبالّ، چارەنووس

تالّووکه (٧٨): پەله، لەز، عەجەله

تاو (١٨٨): «به تاو بارین»: به گوڕم بارین، به لێشاو بارین، به توندی بارین، «تاوه باران»: بارانی توند و له نەکاو و کەم دەوام

تاوان (١٢): جەریمه و قەرەبووی هەڵه. («تاوانبار»: به کەسێک ئەڵێن که خەتا و گوناهی له سەر سابیت بووه و پێویسته که تاوان و جەریمەکەی بدا. که وایه تاوان به مانای گوناه و خەتا نیه و تاوانباریش دەقاودەق به مانای گوناهبار و خەتاکار نیه.)

تاوه ترس (٤٧): وەک تاوه باران، تاوه باران به بارانێک ئەڵێن که بۆ ماوەییێکی کورت (چەند ساتێک) به گوڕم و تاو ئەبارێ و پاشان لێ ئەکاتەوه.

تاین بوون (١٧٣): هاتنه سەر، کەوتنه گیان. ئەڵێن: «رەببی گوللەت بۆ تاین بێ.» (تعیین شدن و نازل شدن بلا و مصیبت برای کسی از طرف خدا)

تراویلکه (٦١): زەوی رمڵ و زیخەڵان که له ژێر تاوی سەختا بریقه ئەدا و له ئاو ئەچێ. (سراب)

ترووکەی لێ نەکرد (٤٩): چاوی لێ نەترووکاند، چاوی تێ بڕی و به بەردەوامی تەماشای کرد.

تریقانەوه (٢٠٨، ١٤٧): له سەر یەک پێکەنین، به دەم پێکەنینەوه خاو بوونەوه و به پشتا کەوتن، به تایبەت بۆ پێکەنینی منالّ به کار ئەبرێ

تفت (١٠٣): تامی گیر، تامێکی که دەمی پێ کۆ ئەبێتەوه

تووتیا (١٧٨): له زووا دەرمانێک بووه بۆ چاوەئێشه

تووش (٨٩، ٨٥): سەخت، هەوای تەڕ و قوڕی زۆر ناخۆش

تۆپەوانە (٢٠٦): تۆپەواخنە، پەڕۆی گولۆلە کراو یان هەر شتێکیتر کە بۆ خنینی درگای دەفر و ئامان یان کونی گونجە و شتی وا بە کار ئەبرێ
تۆخ (٢١٠، ١٦٧): توند، تیژ، خەست، خالیس
تۆڕ (١٠٨، ١٠٣): سەرکەش، بەیدەس، ئەسپێ کە رام نەبێ و سواری نەدا
تۆژەر (٢٤): تۆژکار، لێکۆڵەر، موحەققیق. «کۆڕی تۆژەر»: (گروە تحقیق)
تۆژینەوە (١٨٦، ١٧١): لێ کۆڵینەوە. (تحقیق کردن)
تۆکمە (٢١٠، ٢٠٨): پتەو، پڕناو و قایم
تۆمار کردن (٥٢): سەبت کردن، (ثبت کردن)
تەبەق (١١٤): تەبەک، مەجۆعمەی دار، مەجمعەی دار
تەپلۆس (٤٧): گێژ و وێژ و سەر قورس.
تەپلە (٩٦): کڵاوی لباد
تەپۆڵکە (٢٠٩، ١١٦): خۆڵەکەوان، جێگای ڕۆ کردنی زبڵ، زبڵدان
تەرخان کردن (١٩٥، ١٧، ١٦): وە لا نان بۆ شتێک یان کەسێکی تایبەت. (اختصاص دادن)
تەرە بەستن (٤٣): بە سەر یەکا کەوتن، کۆما بوون لە شوێنێکا. گەڵا توتن و بەری بێسان و شتی وا لە چاڵێکا بە سەر یەکا ئەکەن و دای ئەپۆشن بۆ ئەوەی زووتر بگا و بەوە ئەڵێن لە تەرە دان. تەرە یانی کۆگای بە سەر یەکا کراو و داپۆشراو یان لە چاڵ نراو.
تەرە بوون (٤٦): لە ناو دوور کەوتنەوە، لەووڵات دوور کەوتنەوە
تەریقی (١٠٤): بە خۆدا شکانەوە، خەجاڵەتی کێشان
تەریک کردن (٢٠٢): لە جەمعێک جیا کردنەوە، لە حیسابێک جیا کردنەوە
تەڕەکاری (٢٢): بەری بێسان و شتی وا کە لە هاوینا پەروەردە ئەکرێ و پێ ئەگا (صیفیجات)
تەزانن (١٧٢): ئێش و ئازارێکی لەشی یان دەروونی بە کەسێک گەیاندن وابێ کە بتاسێ، ئەڵێن: «قسەیێکم پێ ووت، هەر تەزانم!»
تەژی (١٤٨): پڕ

**تەسک** (١١٥، ١٠٣): بەر باریک،
**تەم و دوو** (٢٠٦، ٤٣): هولّم و بۆق و دووکەڵ
**تەنانەت** (٨٢): (حتّی)، «تەنانەت پیرەکانیش هاتبوون»: (حتّی پیرها هم آمده بودند.)
**تەنگز** (٤٨): چالّووک، دارۆچکەیێکە کە دڕکی زور سەختی هەیە. «تەنگزە جاڕ»: دەشت و مەزرای پڕ لە تەنگز.
**تەنووره کردن** (٥١): گێژ خواردن وەک چەرخی گێژەلّووکە
**تەووژم** (١٨٢): زەخت، تەئسیر
**تەیار** (١٨٧، ٢٣): ئامادە، ساز. (مجهّز) «تەیار کردن»: ئامادە کردن، ساز کردن
**تیتالّی** (٤٧): گەمە پێ کردن و تەوس تێ گرتن، مەسخەره کردن.
**تیز** (٤٧): شکاندنەوە، تانە لێ دان. «تیز پێ کردن» ئەوەیە کە کەسێکی کە لە کارێ یان لە یارییێکا پێش کەوتووە، پیش کەوتنەکەی خۆی بداتەوە بە چاوی ئەو کەسەدا کە دوا کەوتووە و دۆڕاوە و تیتالّی پێ بکا.
**تیفتیفە دان** (٢٩٢، ١٩٧): سڕینەوەی ژەنگ و ساف و لووس کردن و رووناک کردنەوەی کانزا. (صیقل دادن)
**تێک تەپین** (١٠٨): تێک رووخان، بە سەر یەکا رووخان.
**تێک ڕماندن** (٢٠٩): تێک رووخاندن

## ج

**جارز بوون** (١١١، ١١٠، ١٠٤): وەڕەز بوون، عاسی بوون، بە سەر چوونی تاقەت و تەحەممول
**جام** (٤٩): ئاوێنە
**جامەلووسکێ** (٩٧): خۆشامایی کردن، ماستاو کردن، کلکە سووتێ
**جمە** (٤٥): جمین، جمیان، بزوتن، جم و جوول، زیاتر بۆ بزوتن و جم و جوولّی قەرەبالّغ و پڕایی خەلّک بە کار دێ وەک ئەلّێن: «دیوەخان جمەی

ئەهات» یانی پڕ بوو لە خەڵک و قەرەباڵغ بوو. (جنب و جوش، اسم است از مصدر جمین و جمیان کە بە معنی جنبیدن است.)
جمیان (٤٥): بزووتن، جووڵان
جووقە (٥٣): قووچکەی کڵاو و تاج، پەلێ یان شتێکی وا کە بۆ جوانی لە قووچکەی کڵاو و تاجی ئەدەن
جەماوەر (٤٥): قەرەباڵغ، پڕایی خەڵک،
جیهان ئاڵۆز (١٨٤): کەسێکی کە لە بەر جوانێ دنیا ئاڵوز ئەکا و ئەبێتە هۆی ئاژاوە.

چ

چاوانەی برین (١٢٠): دەمی برین، کونی برین
چاو بە دنیادا هەڵێنان (١٧١): لە دایک بوون، هاتنە سەر دنیا
چاوچڵکن (١٢٥): چاو پیس، بەغیل، حەسوود
چڕ (١٧٢، ٥١، ٣٨): بۆ چیا بە مانای سەخت و ناهەموارە یانی چیایێکی کە بڕین و پیا رۆیشتنی سەختە، بۆ دارستان و شتی وا بە مانای پڕە، بۆ دووکەڵ و تاریکی و شتی وا بە مانای خەست و لە سەر یەک نیشتوو و موتەڕاکیمە.
چڕزان (٥٧): درز بردنی شووشە و سواڵەت و شتی وا
چزاندن (٥٣): ئازار دانێ کە وەک داخ کردن و سووتاندن بە سۆ بێ
چشتێ (٢٨٦): شتێ، شتێک (بن زاراوەی کرماشانی)
چلتیکە (٢٠٩): پارچە قوماشێک کە بە لە یەک دوورینی تیکە قوماشی رەنگا و رەنگ و جۆراوجۆر ساز ئەکرێ
چما (٢٧١، ٤٨): بۆچی؟، ئامرازی پرسیار کردنە، پرسیارێکی کە رەنگی تاجب مانی پێوە بێ.
چنگن (٥٢): جانەوەرێ کە دەس و پای فرەی ببێ. (حشرە)
چنۆک (١٩٦): نەوسن، چاونەتێر

**چو بینی ئاو ئەلەرزێ** (٢٧١): وەک بینی ئاو ئەلەرزێ، سەخت ئەلەرزێ. (بن زاراوەی فەیزوڵڵابەگی)
**چووزەرە** (٦٥): ساقەتی تازە شین بووی گیا، نێرکی تازە لە زەوی دەرهاتووی گیا. (جوانەی ساقەی گیاه)
**چۆک چوونە بەست** (٢٨): ئەوەیە کە چۆکی ئینسان لە ترسان یان لە بەر حیرەت و واق ووڕ ماوی یان لە شیددەتی خەم و خەفەتا هێزی ڕێگا ڕۆیشتنی تیا نەمێنێ.
**چۆڵەمە** (٤٣): دوو تیکە داری باریکە کە نیری پێ ئەبەسن بە ملی گاوە.
**چەتوون** (٤٤، ٤١): سەخت، تووش، دژوار
**چەسپاندن** (٩٤): قسە بردنە سەر، سابیت کردن
**چەقەڵئاسا** (٤٣): وەکوو چەقەڵ، لە گوێنی چەقەڵ
**چەکەرە کردن** (١٢٣): چەقەرە کردن. (جوانە زدن)
**چەمەرێ** (٨٥): ئاهەنگ و هەڵپەڕکێی تایبەتی شیوەن و تازیەباری
**چەوسان** (٤٠): ڕەنج دان، زەحمەت کێشان
**چێژ** (٣٠٠): تام
**چێشتەنگاو** (٣٦): کاتی بەینی بەیانی و نیوەڕۆ کە خۆر تازە بڵاو ئەبیتەوە و هەوا ڕوو بە گەرمی ئەچێ.

## ح

**حەسان** (٢٩٤): مەبەست «حەسسانی کوڕی سابیت» شاعیری تایبەتی پێغەمبەری خودایە (د)
**حەلامات** (٥٥): عەلامات، گیان لە بەری سەیر و سەمەرە، مرۆوی عەجایب
**حەوێقە** (٤٨): حەوێق، بەرزایی ئاسمان، ئەوپەڕی بەرزایی. (اوج)

## خ

**خاكەسەری** (١٨٠، ٥٤): **خاكساری، كڵۆڵی، بەدبەختی، «خاكەسەری كردن»: خۆ كڵۆڵ نیشان دان، خۆ فەقیر نیشان دان، تەوازوع نواندن**

**خل دان** (٩٠): **بە كرژی خواردن، بە خڕی قووت دان**

**خوانی زین** (١٠٩): **ماڵی زین، چاڵی سەر زینی ئەسپ كە جێگای دانیشتنی سوارە**

**خولیا** (٢٩٣): **١- مەراق و ئارەزوو، شێتی، ئاشقی، ٢- شێت، ئاشق**

**خوناوە** (١٩٣، ٦٨): **بارانی دەنک وورد، ووردە باران، نەرمە باران**

**خۆ داڕێژان** (٩٦): **كامڵ بوونی لەش و ئەندامی لاو، بە خۆدا هاتن و ئەستوور و پڕ بوونی ئەندامی مرۆوی تازە باڵغ. (كامل شدن رشد جسمانی)**

**خۆ داهێڵان** (١٧٣): **بڕوانە «داهێڵان»**

**خۆ كوتان بۆ شوێنێک یان بۆ شتێک یان بۆ كارێک** (١٦٩، ٦٨): **بە تەنگەتاوی و تامەزرۆیی چوونە پێشەوە بۆ شوێنێک یان بۆ شتێک یان بۆ ئەنجام دانی كارێک**

**خۆڵ لە كەسێک بە با كردن** (٧٧): **بە سەختی سكاڵا كردن لەو كەسە**

**خۆڵە پۆتێ** (٤٣): **كایە كردن بە خۆڵ وەک مریشک كە لە ناو خۆڵا چینە ئەكا و خۆڵ بە سەر خۆیا ئەكا.**

**خۆ هەڵكێشان** (١١٥): **تاریف لە خۆ كردن، خۆ زیاد نیشان دان، فڕ و فیشاڵ كردن**

**خۆیی** (١٢٣، ١٢٠): **هاودڵ، یەكرەنگ (صمیمی)**

**خەمڵێو** (٥٠): **رازاوە**

**خەوش** (٢٩١): **ناخالیسی**

**خەوشی خۆ بە شتێک رژاندن** (١٣٢): **بە ئارەزووی دڵی خۆ لەگەڵ كردن، تاسەی خۆ بە شتێک رژاندن**

**خەفە** (٢٠٥): **پشووگر، شوێنێ كە هەوای پشووگری ببێ، شوێنێ كە دڵتەنگ بێ، ئەڵێن: «ئەم ماڵە خەفەیە.» یانی دەرەوی بە تەواوی لێ دیار نیە و پیاو دڵی تیا ئەگیرێ**

**خەنیم** (١٣٦): زیدد.دوژمن (ضد)

**خێو** (٢٧): ١- خاوەن، ساحێب، (خدیو) ٢- لە باوەڕی عەواما بە دێوەزمەیێک ئەڵێن کە خاوەنی شوێنێکە و هەر کەس توخونی ئەو شوێنە بکەوێ، دەسی لێ ئەوەشێنێ و ئازاری ئەدا .

د

**داپڵۆخاو** (٢٠٧، ٨٣): پێس داماڵاو بە سووتان

**داتوڵاندن** (٢٨): داڕزاندن، زیان و ئازارێکی سەخت کە سەرما و گەرما و برینی پیس یان هێندێ ماددەی کیمیایی وشتی وا بە گۆشت و پیسی ئەگەیێنێ.

**داتەکین** (١٠٦): داڕژان، بەتاڵ بوون

**دارە دارە** (٨٢): ڕێگا ڕۆیشتنی منالی تازە پا گرتوو کە دەس ئەگرێ بە دار و دیوارەوە بۆ ڕێگا ڕۆیشتن.

**داشداری** (٢٩٣): لایەنگری

**داعبا** (٢٢٧، ٢٢١): دەعبا، جانەوەری نەناسراو

**داکۆکی کردن لە...** (١٢): لە سەر کردنەوە، دیفاع لێ کردن

**داگر** (١٤٩): لە بەر گر. (شامل)

**داگرسان** (١٠٢): هەڵ بوونی ئاوور، ڕۆشن بوونی چرا و شتی وا

**داڵدە دان** (٨٠): پەنا پێ دان

**دانەوێڵە** (٢٢): خەلە، ئەو گیایانەی کە دەنکەکەیان ئەخورێ و لەبەر دەنکەکەیان دائەچێنرێن وەک نیسک و نۆک و پەرشە و گەنم و گەنمە شامی و هتد...، (غلّە)

**داهۆڵ** (٢٢٤): داوەڵ، دوو چڵ دارە کە بە شکڵی خاچ لە یەکی ئەبەسن و لیباسی لە بەر ئەکەن و لە ناو باخ و لە سەر خەرمان ئەیچەقێنن، کاتێ کە با لیباسەکەی بەری ئەشەکێنێ، باڵندە و پەلەوەر هۆ ئەزانێ مرۆوەوە و لی ئەترسێ و لە خەرمان و باخەکە دوور ئەکەوێتەوە. (مترسک)

**داهێڵان** (١٧٣): شۆڕ کردنەوە بۆ خوارەوە. «خۆ داهێڵان»: خۆ شۆڕ کردنەوە و خۆ شل کردن بۆ نوقم بوون لە ئاودا

داهێنان (١٧٢): لەت کردن بە مشار
دایم و قایم (٢٠٤): بەردەوام، هەمیشە
درۆشم (٥٧، ٥٣): نیشانەی تایبەتی، نیشانەیێک کە کۆڕ و کۆمەڵ و پارتێکی پێ ئەناسرێتەوە. (آرم، شعار)
درەوشانەوە (١٨٨): تیشک هاوێشتن
دڕ (٢٢١، ٢٢٠): سەگی دڕندە کە ڕەگێکی وەحشیگەری ببێ و پەلاماری مرۆو بدا
دڕ پێ دان (٢٠٠، ١١٩): شەق کردن، بە زەخت و زۆر بڵاوە کردن بە شتێکی وەک ئاو یان قەرەباڵغی خەڵک و ڕێگە کردنەوە لە ناو ئەو شتەدا
دڕدۆنگ (١٩٨، ١٣٣): لە شکدا. (ظنین)
دزێو (٢٨٨): ناشیرین، ناحەز
دژوێن (٢٠٩، ٥٢): پیس، چڵکن و بۆگەن
دژهاوار (١٦٤): هاواری بە سکاڵا، هاواری بە گلەیی. «دژ» یان «دوژ» یان «دوش»: بە مانای «خراپ» و «ناشیرین» و «ناحەز»ە و وەک هێندێ کەس تێگەیشتوون بە مانای زیدد (ضد) نیە. ئەم جۆرە کەسانە بە ڕواڵەت وای بۆ چو ـ ون کە «دوژمن» بە مانای کەسێکە کە زیددی من بێ ، بۆیێ پیان وایە «دژ» یان «دوژ» بە مانای زیددە. ئەمڕۆکەش بووە بە باو هەر وا ئەڕۆن و بەم پێشبەندە واژەیتر ساز ئەکەن کە هەمووشی هەڵەن؛ بۆ وێنە «دژایەتی» (کە بە مانای زیددییەت بە کاری دێنن.)، «دژبەر» (بە مانای لایەنی بەرانبەر و زیدد)، «دژکردەوە» (بە مانای عکس العمل) و... ڕاستیەکەی ئەوەیە کە «من» [لە فارسیدا: «مەن»] لە ئەسڵا بە مانای فکر و هزرە، کە وایە «دوژمن» یانی کەسێک کە فکر و هزری خراپی لە سەردایە. لە زمانی پەهلەویدا «بەهمەن» بە مانای «فکری چاک»ە و لە ئایینی زەڕدەشتیدا «بەهمەن» یەکێکە لە ئەمشاسپەندان (فریشتە موقەڕڕبەکانی درگای ئەهوورا مەزدا خودای گەورە). لە بن زاراوەی ناوچەی فەیزوڵڵا بەگیدا بە ئاژەڵێکی کە کەملەوەڕی ئەکا و باش نالەوەڕێ، ئەڵێن: ئەو ئاژەڵە دژلەوەڕە، یان: دژلەوەڕی ئەکا. لە فارسی کۆن و نوێشا گەلێ واژە بو ـ ون و هەن کە بە پێشبەندی «دوژ» ساز کراون و «دوژ»

لە هەموویانا بە واتای «خراپ» و «ناحەز»ە نەک زیدد و موخالیف؛ بۆ وێنە: «دوژنام» (ناوی خراپ، ناتۆرە، جنێو)، «دوژ برو» (ناوچاو تاڵ، کەسێکی کە برۆی تێک ناوە)، «دوژپەسەند» (کەسێکی کە پەسەند و سەلیقەی خراپە و شتی خراپ هەڵ ئەبژێرێ)، «دوژکام» و «دوژکامە» (کەسێکی کە بە کام و بە ئارەزووی خۆی ناژێ، بەدکام، خەفەتبار)، «دوژخیم» (بەد سروشت، بەدزات _ خیم بە مانای سروشت و تەبیعەتە_)، «دوژ ئاگاه» (دوژئاگا، بەدهزر، کەسێکی کە فکری خراپی لە سەرایە، بەدخوو)، «دوژئالوود» (بەدخوو، رق هەستاو، توورە) و «دوژوار» (سەخت)... «دوش»یش هەر سوورەتێکیترە لەم پێشبەندە. لە فارسی ئەمڕۆکەدا لە باتی «دوژمن» ئەڵێن: «دوشمەن» و لە جیاتی «دوژوار» ئەڵێن: «دوشوار». لە کوردیشا هێندێ واژە هەن کە بە «دوش» ساز کراون، وەک: «دوش» بە مانای گرژ و سیس. بە خوشکی مێردێش ئەڵێن: «دوش» یان «دش». هەروەها «دوش دامان» و «دوش دابردن» بە مانای مات و کز دانیشتنە.

دڵبەرین (٣٠): دڵفرەوان، دڵفراوان، بە گوزەشت، بە سەبر. هەڵبەت «دڵفراوان» بە مانای بەخشەندەش هاتووە.

دڵ تۆرێن (٦٠): شتێکی کە دڵ بۆی نەچێ و لی بێزار بێ

دڵفەرێح (٣٢): دڵگوشاد، شاد، دڵخۆش

دڵم لێ دەدا (١١٣): شکم بۆی ئەچێ، هەستی پێ ئەکەم

دڵمەند (٢٠٠): تۆراو، زیز، بەگلەیی

دڵهەژێن (٨٦): شتێکی کە دڵی پیاو راچڵەکێنێ و وە خۆی بێنێتەوە.

دڵی پیاو هەڵدەشێوێنێ (٤١): دڵی پیاو هەڵئەشێوێنێتەوە، دڵی پیاو بە یەکا دێنێ، ئەبێتە هۆی رشانەوە، بێزی پیاو هەڵئەسێنێ.

دمەڵ (١٠١): کوان، کوڤان، قونێر. (دمل)

دنە: هان، هان دان. «دنەی ژیوار» (٥٦): هانی ژیان، شتێکی کە پیاو هان بدا و ئاوات و ئارەزووی بداتێ بۆ مان و ژیان.

دنەی فرمێسک (٥٣): بزووتن و سەر هەڵدانی فرمێسک لە چاوا بێئەوەی بڕژێتە خوارەوە.

**دورڕەگ** (٢٢٤): **کەسێک کە دایک و باوکی لە دوو ڕەگەزی جیاواز بن**
**دوون** (٢٩٠): **بێ پلە و پایە، بێنرخ، پەست**
**دۆخ** (٨٩): **حاڵەت**
**دەربەند** (١٩٥): **دەرەی تەنگ، ڕێگە و کۆڵانێ کە ڕێی دەرچوونە دەرەوەی نەبێ.** (درەی **تنگ، بنبست**)
**دەر و بام** (٢٩٠): **درگا و بان...**
**دەروو** (٤٦): **ڕێگەی گوزەر**
**دەروون کەیل** (٣٥): **دڵ پڕ لە ئازار و خەفەت، یەکجار خەمبار.** «**کەیل**» **یانی پڕ.**
**دەرەتان** (١٧٣): **ڕێگەی دەرباز بوون، ڕێگەی ڕزگار بوون لە تەنگانە. (مفرّ، مخرج)**
**دەریای داگر** (١٥٣): (**بحر محیط، اقیانوس**)
**دەسکرد** (٢٠٧): **دەسساز، غەیرە سروشتی، شتێک کە سروشتی نەبێ و بە دەسی مرۆو ساز کرابێ**
**دەعبا** (٤٧): **داعبا، جانەوەری نەناسراو**
**دەغەز** (٥٠): **ناساغی، نەخۆشی**
**دەغەڵ** (٢٨٧): **ناراستی، بە مانای تەمبەڵیش هاتووە**
**دەق** (٤٠): (**متن**)
**دەکارم** (٤١): **ئەتوانم**
**دەلال** (١٦٨، ١٤١): **جوان، خوێنشیرین، ڕەزاسووک، سەعاتسووک**
**دەمار** (٥٣): **ڕەگ**
**دەمارگرژی** (١٩٩): **سەختگیری لە باوەڕا. (تعصّب)**
**دەمامک** (٢٢٧): **نیقاب.** (**نقاب**)
**دەم تێ ژەندن** (١٦٦، ٩٠): **دەس کردن بە خواردنی شتێک، ئەم زاراوە زیاتر بۆ خواردنی سەگ و ئاژەڵ بە کار دێ.**
**دەم و دەس** (١٧٧): **دەس بە جێ، فەورەن. (فوری، فوراً)**

دەمی تاق (٤٦): لە «دەم بە تاق وێستان» و «دەم بە تاق مان»ەوە هاتووە کە بە واتای دەم داچەقاندن لە بەر واق ووڕ ماویە و نیشانەی ئەوپەڕی واق ووڕ مانە.
دەنکی ئیشق (٣٩): دانەی دڵ، خاڵی دڵ. قەدیمیان دڵیان بە کانگا و سەرچاوەی خۆشەویستی و مەعریفەت زانیوە و پیان وابووە کە لە دڵیشا خاڵێکی رەشی وورد هەیە کە ئەو خاڵە دڵی دڵە، واتە لە چاو جێگاکانیتری دڵ هەڵبژاردە و سەتۆپە و سەرچاوەی مەعریفەت و ئەوینە.
دەنگ (١٨١): (رأی)
دهۆ (٢١٥): گزی و فێڵ و پیلان
دیرەگ (٢٧): ئاسۆی سەر کێو و بڵیندایی، (خظالرأس کوه) (بن زاراوەی فەیزوڵڵابەگی)
دیار (٧٨): ئاشکرا، بەرچاو. بڕوانە «هەرد و دیار»
دیم (٤٥): دیمەن، دیدار، رواڵەت، روخسار

ر

رادان (٥٠): وەبەر خۆ دان، بە بێ رێزی لە خۆ دوور خستنەوە.
راڤە (١٦٥): مانا لێک دانەوە، واتا شی کردنەوە، شەرح و تەفسیر
راکە (٥٧): «سەرت راکە»: سەرت هەڵێنە، سەرت بەرز بگرە
رامان (٤٤، ٤٩): تێ فکرین، بە قووڵی فکر کردنەوە
راوپرس (٩٧): پرس و را کردن، را گۆڕینەوە. (مشورت) «راوێژ» کە بەم مەعنایە بە کاری دێنن هەڵەیێکی زەقە
راهێن (٥٥): (مربّی)
رچ دان (٢٠٣، ١٩٤، ٨٣): بەستن و بە سەهۆڵ بوونی ئاو بە تەوژمی سەرما.
رچە (١٩٦): باریکە ڕێ، شوێنە پایێک لە ناو بەفر و شتی وا دا کە بووبێتە رێگە
رسکان (٢٠٩، ٢٠١، ١٣١، ٩١، ٥): روان، شین بوون و لە خاک دەرهاتن، هەڵدان و گەورە بوون. (رویش، رشد)
رکە (٤٤): قەفەس

رماندن (٢٢٣): رووخاندن
رنران (٤٨): رنرانەوە، بە دەس لێ کرانەوە، بە دەس هەڵکەندران
روانگە (٣٦): جێگەی روانین، مەنزەر، مەنزەرە
رووت (٢٧٠): خالیس، بێخەوش. (ناب)
رووی زەوی هەڵگرت (٤٥): هەموو زەوی داپۆشی، لە بەر زۆری زەوی بە ئامان هێنا.
رۆحسووک (٧٣): گوێ رادێر و بێ پۆز و دەمار، کەسێکی کە بە دەم خەڵکەوە ئەچێ و کار و باریان بۆ جێ بە جێ ئەکا
رۆخ (٧٩، ٧٣): قەراغ، لێوار، کەنار
رۆژت بە سەر چووە (١١٢): تافت نەماوە، دەورت نەماوە، عومرت تەواو بووە
رۆمی (٢٧١): مەبەست سپی پیسە لە بەرانبەر زەنگیدا کە رەش پێسە
رەپستە (٧٤): ئاوەنیا، دەغڵێک کە لە زەوی ئاودراوا داچێنراوە.
رەتاندن (١٧٢، ١٤٦): رادان، غار پێ کردن، مانوو کردن
رەزا سووک (٨٦): خوێن شیرین، لە دڵەوە نزیک، لە بەر دڵان. دژی رەزاگران و خوێنتاڵە.
رەسەد کردن (٢٠٤): گرتنە ژێر نەزەر و چاوەدێری کردنی ئەسێرە لە ئاسمان بە ئامرازی تایبەت
رەقاندنەوە (٣٢): رێک گوشین، زەخت خستنە سەر ئەندامێکی لەش و شتی وا. «شان و ملیان رەقاندمەوە» یانی شان و ملیان بە سەختی رێک گوشیم. «قسە رەقاندنەوە»ەش هەیە یانی بە پێ داگرتن و تەئکیدەوە قسە کردن، زیاتر بۆ قسەی ناخۆش بە کار دێ. (بن زاراوەی فەیزوڵڵابەگی)
رەنگ (٧٨): جۆر، شێوە. «بە چ رەنگێ؟»: بە چ جۆرێ؟، بە چ شێوەیێ؟
رەوەز (٧٩، ٦٢): چین چینە بەردی ناوقەد و سەری کێو. (صخره)
رەوەک (٧٨): سڵ، سرگ، تۆڕ
رەوی (٥٠): رۆیی، هەڵات
ریچە کردن (١٨٢): دیانەچیرە، دیان نیشان دان بۆ دەربڕینی رق و قین

**ڕێنوما** (١٨٩، ١٨٧): ڕێنوێن، ڕێ نیشاندەر
**ڕێوی پێچ** (٢٢١): ڕێگا ڕۆیشتن و هەڵاتنی تایبەتی ڕێوی کە قەت ڕاست ناڕوا بەڵکوو لە کاتی ڕۆیشتن و هەڵاتنا بۆ شوێن گوم کردن بە پێچ و دەور ئەڕوا

## ز

**زاڵەتەرەک** (٢٠٩): کەسێک کە لە ترسا وەختە بمرێ. (زهرەترک)
**زانستگە** (١٨): (دانشگاه) من وام پێ چاکە بۆ دانشگاه واژەی زانستگە بە کار بێنین، ئەو دەم ئەتوانین واژەی «زانکۆ»ش بۆ کۆلێژ بە کار بێنین.
**زاووماک** (٦٥): تێک بەردانی بەرخ و مەڕ، بەردانی بەرخ لە مەڕ بۆ مژین و شیر خواردن
**زایەڵە** (١٠٣، ٨٤): دەنگی مۆسیقای نەرم و خۆش، دەنگی ئاوی خوڕ و زەنگ و گۆرانی ووتنی ئارام و لەبەر خۆوە و شتی وا. (زمزمە)
**زرت** (٤٦): نیگای تیژ، تەماشا کردنی بە ناتەبایی و دڕدونگی. جیاوازی نیگای زرت لەگەڵ زەق ڕەنگە لەوەدا بێ کە زرت زیاتر بە نیگاییێک ئەووترێ کە ڕەنگی ناتەبایی و ناکۆکی پێوە بێ.
**زرێ** (١١٤، ٩٦): زرە، سەرکەوای لە ئاسن هۆنراو کە بۆ شەڕ لە بەر ئەکرا
**زلگۆ** (٣٤): بڵێندگو، (بلندگو)
**زلهێز** (٢٤): (اَبَرقدرت)
**زناو** (١٨٧): زنە، ئاویک کە لە زەوی هەڵئەقوڵێ و تەووژم و خێرایی و دەوامی بە قەد کانی نیە، کانیاوی چکۆلە
**زنە کردن** (١٠٣): ئاو دەڵاندنی زەوی، «زنە»: کانیاوی چکۆلە، ئاوێکی کە لە زەوی هەڵ ئەقوڵێ
**زوقم** (٢٠٣): توێژی ناسکی وورده بەفر و سەهۆڵ کە لە سەرمای سەختا لە سەر شت ئەکەوێ
**زوڵمات** (١٨٧): تاریکان
**زووێر** (٥٠، ٤٤): زوێر، زیز، تۆراو

**زەرد** (٣٩): زەرد و ماە، تیشە شاخی زۆر بڵند و ساف، هەڵدێر. (پرتگاه کنار کوه)
**زەردباو** (١٠٣): مەیلەو زەرد. (رنگ مایل به زرد)
**زەردە** (٥٢): زەردە خەنە، بزە، (لبخند)
**زەردەپەڕ** (٧١): زەردەی خۆر لە کاتی ئاوا بوونا
**زەردەی خۆر هات** (٣٢): خۆر دەرکەوت، خۆر بڵاو بووەوە،بۆ کاتی بەیانی بە کار دێ.
**زەرووئاسا** (٥٤): وەکوو زەروو، لە گوێنی زەروو. «زەروو» یان «زاروو»: کرمێکی پان و گەورەیە کە لە ناو ئاو و لە جێگای تەڕ و نما ئەژی و ئەنووسێ بە لەشی ئاژەڵ و مرۆوەوە و خوێنەکەی ئەمژێ، (زالو)
**زەرڕ** (١٩٩): زەرەر، زیان
**زەمەند** (١٠٠): زەمەن، زەمینی سەوزەڵانی و پڕگیا
**زەنا** (٤٥): هەرا هەرا، «زەنا زەنا» یانی هەرا هەرا، قاڵمە قاڵم، بگرە و بەردە.
**زەوەند** (٢٤): زۆر، ئەڵێن: «ئەو شتە زۆر و زەوەندە.»

## ژ

**ژیکەوانە** (٦٤): ژێی کەوان، چەرمی کەوان، بەنی کەوان. (زه کمان)
**ژیوار کردن** (٣٤): ژیان، بەرێ چوون.

## س

**سابات** (٢٧٦): کەپر، هەیوانی بەر پەنجێرەی نوهۆمی سەروو
**ساج** (١٢١): دارێکی رەشی سەخت بووە کە تەخت و کورسی و کەرەسەی رازاندنەوەی ناوماڵیان لێ دروست کردووە.
**سام** (١٤٨، ٥١): ترس، هەیبەت
**ساماڵ** (١٤٨، ١١١): ئاسمانی بێهەور
**ساویلکە** (٥٦): سافیلکە، دڵ سادە و خۆش باوەڕ و زوو فریو خۆر. (ساده لوح)

سپەر (١٦٦): قەڵغان، مەتاڵ

سپیدار (١٨٧): دارێکە وەک چنار کە لە ناوچە کوێستانیەکانی کوردستان زۆرە

ستار گرتن (٥١): سرەوتن، وێسان، هەدا دان، ئارام گرتن

سرگ (١٣٢): رەوەک، تیژ، گیاندارێکی کە دەسەمۆ و لە سەر خۆ و هێمن و ئارام نەبێ

سریشک (٤٠): فرمێسک

سریوە (٢١١، ١٣١، ٦٧، ٤٥): نەرمە با، سروە. (نسیم) «سریوەی زەمان»: هاتنی زەمان، گوزەرانی زەمان، تێ پەڕینی زەمان. (وزش زمان)

سکاڵا (١٨١): شکایەت. (شکایت)

سڵ بوون (٥٠): رەو کردن، رەوین و دوور کەوتنەوە لە ترسان

سڵ کردن (٧٨): رەوین و دوور کەوتنەوە لە ترسان

سووچ (١٩٩): گوناه، خەتا، هەڵە

سوورفل (٢٩): مرۆوی سوور و رەنگ کاڵ و موو زەرد. «فل بوون» یانی خاو بوونەوە لە بەر خۆر. چون مرۆوێ کاڵ و کرچ و رەنگ سوور تاقەتی بەر خۆری نیە و لەبەر خۆر زوو خاو ئەبێتەوە و دائەهێزرێ بۆیە بەم چەشنە مرۆوانە ئەڵێن سوورفل.

سوێ (٥١، ٤٤): ئێش و ئازاری دەروونی

سوێ هاتنەوە (١٣١): مردن لە خەم و خەفەتا

سۆراب (٩٥):

کورتەی چیرۆکی ڕۆستەم و سۆراب وەک فیردەوسی تووسی ئەیگێڕێتەوە:

ڕۆژێ ڕۆستەم دڵتەنگ ئەبێ، هەوای ڕاو ئەکەوێتە سەری و بە تەنیا ڕووەو سنووری تووران ئەڕوا. کە ئەگاتە نزیک سنوور ئەبینێ ئەوە بێروونێکە پڕە لە گۆڕ. بە بینینی ئەو ڕوانگەیە شاد ئەبێ و دڵی ئەگەشێتەوە. ڕەخش تاو ئەدا و بەکرژی دوو سێ کەلاک ئەخا. ئەوسا، ئاورێکی خۆش ئەکاتەوە و هەر وەکوو پیشەی گ کاتێکیەتی، دارێک لە ڕیشەوە هەڵئەکەنێ و ئەیکا بە شیش و لاشەی نێرەگۆڕێکی بەساغی پێوە ئەکا. گۆڕەکە ئەبرژێنێ و بەئیشتیا هەتا ئاخر ئەیخوا و تۆزی ئەبا بە حەوادا. کە تێری خوارد، بۆی ئەخەوێ. خەوێکی

قورسی بە سەرا دێ. ڕەخشیش لەو چیمەن و مێرغوزارەدا بۆخۆی بەئازادی ئەسووڕێتەوە و ئەلەوەڕێ. لەو کاتەدا چەند سواری تورک (توورانی) بەوێدا تێئەپەڕن. ڕەخش سەرنجیان ڕائەکێشێ. بە کەمەند ئەیگرن و لەگەڵ خۆیان ئەیبەن؛ بە نیازی ئەوەی کە تووی لێ بگرنەوە.

ڕۆستەم کە لە خەو هەڵئەسێ و ئەبینێ ئەسپەکەی نەماوە، یەکجار دڵتەنگ و پەرۆش ئەبێ و گەلێ خۆی سەرکۆنە ئەکا. پاشان بە ناچار زین و جل و بەڕی ڕەخش ئەدا بە شانی‌دا و بە شوێنی پای ئەسپەکەدا ڕێگەی تووران ئەگرێتە بەر. وەهایە ڕەسمی یانەی بەدرەوشت

گا لە بانی زین، گا زین لە بان پشت

ئەڕوا تا ئەگاتە شاری سەمەنگان. ئەم شارە شاری سەرسنووری وولاتی توورانە. پاشای ئەم شارە فەرمانبەری ئەفراسیاو، شای توورانە. شا کە هەواڵی هاتنی ڕۆستەم ئەزانێ، لەگەڵ هەموو گەورەیانی درگای خۆی ئەچێ بە پێشوازیەوە و زۆر بەگەرمی بەخێرهاتن و دڵنەوایی ئەکا. ڕۆستەم ئەڵێ: «ئەسپەکەم لە ڕاوگە لێ گوم بووە و تا ئێرە شوێنیم هێناوە بەڵام لەمە بەولاوە قامیشەڵان و زۆنگاوە. ئەگەر هەوڵێک بدەی بۆ دۆزینەوەی، زۆرت سپاسمەند ئەبم؛ ئەگەریش نەدۆزرێتەوە، ئەوا سەری گەلێ سەرۆکان ئەبێ ببڕدرێ.» شا ئەڵێ: «تۆ جارێ وەرە بحەسێوە و ئەمشەو میوانی من بە، دڵنیا بە جیهان بە ئارەزووی تۆ ئەگەڕێ.»

ئەو شەوە شای سەمەنگان گەورەیانی درگای خۆی بانگێشتن ئەکا و بەخۆشی ڕۆستەمەوە میوانی و بەزمێکی گەورە پێکدێنێ. درەنگانێ ڕۆستەم هەڵئەسێ و بە مەستی ئەچێ لە دیوێکی تایبەتی ئەخەوێ. نیوەشەو لەناکاو دەنگی سرتە و چپەی بەر گوێ ئەکەوێ. سەر هەڵئەبڕێ، ئەبینێ ئەوا کیژێکی ناسک و نازداری پڕعەقڵ و هونەر نۆکەرێکی پێش خۆی داوە، بە هێمنی درگا ئەکاتەوە و دێتە ژوورەوە؛ ئەچێتە ژوورسەری ڕۆستەم. ڕۆستەم لی ئەپرسێ: «کێیت و بەم شەوە چیت ئەوێ؟» کیژە ئەڵێ: «ناوم تەهمینەیە و کچی پادشای سەمەنگانم. دەمێکەیە ناوبانگی ئازایەتی و پاڵەوانەتی و قەد و باڵای تۆم بیستووە و کەوتوومەتە داوی ئەوینی تۆوە. ئارەزووم ئەکرد کە جارێک

لەنزیکەوە بتبینم. بێجگە لەمەش بە ئاواتەوەم کوڕێکم لە تۆ ببێ کە وەک تۆ پاڵەوان و ناودار بێ. ئێستاش ئەگەر لە ڕووی نەریت و ئایینەوە بمخوازی، هی تۆم. ڕۆستەم هەر ئەو شەوە خوازبێنی تەهمینە لە باوکی ئەکا و مارەی ئەبڕێ. ئەو شەوە تا ڕۆژ پێکەوە ئەبن. دەمەو بەیان ڕۆستەم مووروویێک لە باڵی خۆی ئەکاتەوە و ئەیدا بە تەهمینە و پی ئەڵێ: «ئەگەر کچت بوو ئەم مووroوە بدە لە قژی و ئەگەریش کوڕت بوو بیبەسە بە باسکیەوە. ئەمە نیشانەی باوکیەتی.»
بەیانی ڕەخش بە ڕۆستەم ئەدەنەوە و لێئەدا ئەگەڕێتەوە بۆ ئـێران.
دوای نۆ مانگە و نۆڕۆژە تەهمینە کوڕێکی ئەبێ وەک مانگی تیشکهاوێژ. ڕاست لە وێنەی ڕۆستەم و سامی نەریمان. لە بەر ئەوەی کە گۆناکانی ئاڵ ئەبێ، تەهمینە ناوی ئەنێ «سۆراب»؛ واتە: «سووراو». بە یەک مانگانەیی وەک یەکساڵانە ئەبێ. لە سێ ساڵانەییدا دەس ئەکا بە چەوگانبازی. لە پێنجساڵانەییدا تیر و کەوان هەڵئەگرێ و ئەچێتە ڕاو و شکار. کە ئەبێ بە دە ساڵان، لەو ناوەدا کەس نابێ بوێرێ پەنجە بخاتە پەنجەی و زۆرانی لەگەڵ بگرێ.
ڕۆژێ ناوی باوک و باپیر و بنە و بنەچەکی خۆی لە دایکی ئەپرسێ و هەڕەشەی لێ ئەکا کە ئەگەر پی نەڵێ، ئەیکوژێ. دایکی، ئەووەڵ زۆر لی ئەپاڕێتەوە کە واز لەم پرسیارە بێنێ و پی ئەڵێ بێت و باوکت ببیسێتەوە کە تۆ ئاوا بە خۆدا هاتووی و گەورە بو ـ وی، ئەتبا بۆ لای خۆی و من بە هەناسە ساردی ئەمێنمەوە. پاشانیش کە ئەزانێ دەس هەڵناگرێ، پی ئەڵێ: «تۆ کوڕی ڕۆستەمی؛ نەوەی زاڵی و لە بەرەی نەیرەم (نەریمان)ی».
سۆراب کە ئەمە ئەزانێ، ئەڵێ: «جا من لە بەرەیێکی ئاوا ناودار بم، ئیتر شاردنەوەی بۆ چیە. ئێستاش کە ڕۆستەم باوک بێ و من کوڕ، بۆ ئەبێ کەسێکی-تر لەم جیهانەدا خاوەنی تاج و تەخت بێ؟ لەشکرێکی بێ ئەژمار لە تورکان کۆ ئەکەمەوە و هێرش ئەبەمە سەر کەیکاووس، شای ئێران. لەسەر تەخت هەڵی ئەسێنم و تاج و تەختەکەی ئەدەم بە ڕۆستەم. پاشان دێمەوە و سەری تەختی ئەفراسیاویش ئەگرم.

زوو بە زوو لەشکرێکی گرانی لێ کۆ ئەبێتەوە. هەواڵ ئەگا بە ئەفراسیاو. ئەفراسیاو ئەمە بە هەلێکی باش ئەزانێ بۆ لە ناو بردنی ڕۆستەم. دوازدە هەزار جەنگاوەری هەڵبژاردە ئەدا بە دوو پاڵەوانی گەورەی خۆی، «هوومان» و «بارمان»، و لەگەڵ دیاری و پێشکەشییێکی زۆرا ئەینێرێ بۆ سۆراب. نامەیەکیشی بۆ ئەنیرێ و تیایا ئەنووسێ: «ئەم لەشکرە لە ژێر فەرمانی تۆدایە و چەنی‌تریش بڵێی بۆت ئەنێرم. ئەگەر بتوانی تاج و تەختی ئێران بە دەس بێنی، دنیا لە شەڕ و کێشە ڕزگاری دێ و ئەحەسێتەوە.» لە بنیشەوە هوومان وبارمان فێر ئەکا کە کاتێ دوو لەشکری ئێران و توووران بەرانبەری یەک ئەوێسن، نەهێڵن ڕۆستەم و سۆراب لە یەک ئاشکرا بن و یەکتری بناسن. ئەڵێ: «بەشکوو ڕۆستەم بە دەسی ئەم لاوە دلێرە بکوژرێ. ئەو دەم شەوێک لە خەوا بدەن بە سەر سۆرابا و ئەویش بکوژن.»

تەهمینە دوای ماوەیێک شیوەن و خۆ ڕنین کە ئەزانێ سۆراب لە سەر ڕۆیشتن سوورە و هەر ئەڕوا، ئەو مووروووەی کە ڕۆستەم پی داوە، ئەیبەسێ بە باڵی سۆرابەوە و ناونیشانی ڕۆستەمی پێ ئەدا؛ وابێ کە تووشی بوو، بیناسێتەوە. بێجگە لەمەش کەسێکی جێ متمانەی خۆی کە پاڵەوانێکە بە ناوی «زەندڕەزم» و پێشتر ڕۆستەمی دیوە و ئەیناسی، ئەخاتە تەک سۆراب تاکوو لە کاتی خۆیا ڕۆستەمی پێ نیشاندا.

سۆراب بە لەشکرەوە دێ ئەگاتە سەر سنووری ئێران. ئێرانیان لەم شوێنەدا، لە سەر سنوور، دژ (واتە: قەڵا)یێکیان هەیە بەناوی «دژی سپی». فەرماندەری ئەم دژە پاڵەوانێکە بە ناوی «هوجیر» کە کوڕی «گۆدەرزە». هوجیر دێتە مەیدانی سۆراب و سۆراب لە چاو لێک‌نانێکا لە سەر زین هەڵی ئەگرێ و ئەیدا بە عەرزا و دەس و پای ئەبەسێ. پاشان کچێکی دلێر بە ناوی «گوردئافەرید» بە بەرگی پیاوانە و زرێی شەڕەوە لە دژ دێتە دەرەوە و مەیدان‌داری سۆراب ئەکا. ئەویش کە تێ ئەگا لەگەڵ سۆرابی پێ ناکرێ، ڕوو وەرئەگێڕێ و هەڵدێ. سۆراب تی هەڵئەکا و بە کەمەند ئەیگرێ. دەس ئەبا کڵاوخوودەکەی لە سەر لا ئەبا، قژی پەخش ئەبێتەوە و سۆراب ئەزانێ کە کچە. گوردئافەرید کە ئەزانێ پێوە بووە، پەنا ئەباتە بەر عیشوە و مەکری ژنانە. بەدەم سۆرابەوە پێئەکەنێ

و ئەڵێ هی تۆم، بەڵام ئەگەر بەم جۆرە بمگری و بمبەیتەوە ناو لەشکرگا، هەم ئابڕووی من ئەچێ و هەم هی خۆت؛ ئەڵێن سۆراب لە مەیدانا لەگەڵ کچێک نەبەردی کرد. بەرم دە با بچمەوە ناو دژەکە. ئەوسا درگات لێ ئەکەمەوە و کە هاتیتە ناو دژ، دژ و خاوەنْدژ و ماڵ و سامان هەمووی هی خۆتە. بەم جۆرە سۆراب فریو ئەخوا و بەری ئەدا. گوردئافەرید کە ئەچێتەوە ناو دژ درگا دائەخا و دێتە سەر دیواری دژ و گەلێ گاڵتە بە سۆراب ئەکا. سۆراب سەخت ڕقی هەڵئەسێ بەڵام چون کات درەنگ ئەبێ و تاریکان دادێ، هیچی پێ ناکرێ. هەڕەشەی لێ ئەکا بۆ ڕۆژی داهاتوو و ئەگەڕێتەوە بۆ پەردەسەراکەی خۆی.

هەر ئەو شەوە ئێرانیان ئەپێچنەوە و دژ چۆڵ ئەکەن. گەژدەهمی پیر، باوەکی گوردئافەرید، نامەیێک بە پەیکی تیژڕەوا بەرێ ئەکا بۆ کەیکاووس، شای ئێران، و هەواڵی هاتنی ئەم لەشکرە و ئەم پاڵەوانە تازە پێگەیشتووە بێحەریفەی پێ ئەدا. ئەنووسێ: «مەگەر ڕۆستەم ئەگینا لە سپای ئێرانا پاڵەوانێکم پێ شک نایێ کە بوێرێ بچێتە مەیدانی ئەم لاوە.»

کەیکاووس کە نامەکەی پێ ئەگا، پاڵەوانان و گەوەرەپیاوانی درگا کۆ ئەکاتەوە و پرس و رایان لەگەڵ ئەکا. تێکڕا بڕیار ئەدەن کە بنێرن بە دوای ڕۆستەما. کەیکاووس «گیو»ی کوڕی گۆدەرز، پاڵەوانی گەورەی ئێرانی، بۆ ئەم کارە هەڵئەبژێرێ و پی ئەڵێ وەک دووکەڵ لوول بە و بچۆ بۆ زابول بە دوای ڕۆستەما. نەکەی لەوێ پشوو بدەی و بمێنیتەوە. نامەیێکیش بۆ ڕۆستەم ئەنووسێ و پی ڕائەگەیێنێ کە حاڵ و وەزع ئاوایە و هەر کە ئەم نامەت پێ گەیی، چ ڕۆژ بوو چ شەو، قسەت لە دەما بوو تەواوی مەکە و وەرە خۆت بگەیێنە ئێرە.

ڕۆستەم کە ئەم هەواڵەی پێ ئەگا، سەری سووڕ ئەمێنێ لەوەی کە لەبەرەی تورکان (توورانیان) پاڵەوانێکی وا هەڵکەوتووە. ئەڵێ: «ئەمە لە بەرەی سەربەستان دوور نیە بەڵام پیاوی وا تا ئێسا لە ناو تورکانا نەبینراوە.» ئەووەڵ شکی بۆ کوڕەکەی خۆی ئەچێ بەڵام پاشان ئەڵێ: «ئەو هێشتا زۆر مناڵە و نەبووە کەس لە تەمەنێکی وادا بێتە مەیدانی شەڕەوە.» بە گیو ئەڵێ:

«دابەزە، ڕۆژێ ئەمێنینەوە، پشوو ئەدەین و لێوێ تەڕ ئەکەین، ئەوسا ڕێ ئەکەوین. مەگەر بەختم خەوتبێ، ئەگینا ئەمە کارێکی ئاستەم نیە.»
ئەو ڕۆژە بە خواردنەوە ڕائەبوێرن. بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆستەم خومار ئەبێ؛ هەر لە ئەوەڵی بەیانیەوە تێ هەڵئەچێتەوە، دەس ئەکا بە مەی خواردنەوە. مەست ئەبێ و ئاگای لە دنیا نامێنێ. کاووسی هەر وە بیریش نایێتەوە. ڕۆژی سێهەمیش هەر وا. سەری چوارەی گیو ساز ئەبێ و بە ڕۆستەم ئەڵێ: «کاووس تۆندەتەبیعەتە. کاتێ توورە ئەبێ، ئاگای لە لای خۆی نامێنێ. ئەم کارەشی زۆر لەبەر چاو گرینگ و گەورەیە. بێت و ئەونە درەنگ بچینەوە بۆ درگا، دنیا ئەدا بە یەکا.» ڕۆستەم ئەڵێ: «باکت نەبێ. کەس نیە بوێرێ لە ئێمە توورە بێ.» ئەو ڕۆژە بە کاوەخۆ ڕێ ئەکەون و دێن بۆ درگای شا.
کە ئەچنە بەردەم شا و کوڕنووشی بۆ ئەبەن، جوابیان ناداتەوە. ئەووەڵ لە گیو توورە ئەبێ و ئەگوڕێنێ بەسەریدا. پاشان ئەڵێ: «ڕۆستەم کێیە کە فەرمانی من لە عەرز بدا؟ بیبەن لە داری دەن! لای بەن لەبەر چاوم! نەی بینم!» ڕوو ئەکاتە تووس (پاڵەوانی هەرە مزنی ئیران لە دوای ڕۆستەم) و پی ئەڵێ: «بچۆ هەر دووکیان بەرە بە زینوویی هەڵیانواسە.» تووس بە نیازی ئەوەی کە ڕۆستەم بەرێتە دەرەوە تا کاووس هێور ئەبێتەوە، ئەچێ دەسی ڕۆستەم ئەگرێ. پاڵەوانان هەموو لەم کارەی تووس سەرسووڕ ئەمێنن، پیان وایە کە بە ڕاستی ئەیەوی بیگرێ. ڕۆستەم توورە ئەبێ و ئەگوڕێنێ بەسەر کاووسا و ئەڵێ: «بەسیە ئەم نێڵە نێڵ و ئاگر بەرپا کردنە! تۆ کەی پادشایت! هیچ کارێکت نیە کە بەجێ بێ. ئەگەر ڕاست ئەکەی، بڕۆ سۆراب بە زینوویی هەڵواسە.» ئەمە ئەڵێ و بە پشتەدەس ئەدا بە دەسی تووسا. تووس وەک ئەوەی کە فیلی مەست خۆی لێ دابێ لەتر ئەبا و بەسەرەوە ئەڕوا. ڕۆستەم بە لایدا تێ ئەپەڕێ و دێتە دەرەوە. سواری ڕەخش ئەبێ و لێئەدا ئەڕوا.
ناوداران ئێش بە دڵیان ئەگا. گۆدەرزی پیر ئەنێرن بۆ لای شا. گۆدەرز گەلێ بە سەر شادا دێ و ئامۆژگاری ئەکا. شا پەشیمان ئەبێتەوە و گۆدەرز ئەنێرێ بەدوای ڕۆستەما. پاڵەوانان و گەورەپیاوانی درگا لەگەڵ گۆدەرز ئەچن بەدوای ڕۆستەما. کە پی ئەگەن، هەرچی لی ئەپاڕێنەوە، ناگەڕێتەوە. سەرئەنجام

گۆدەرز بە سرتە پی ئەڵێ: «پیاوی چاک بە، بەم کارە ناوی خۆت نەوی مەکە؛ بێت و ئێسا بڕۆی، عالەم ئەڵێ لە ترسی سۆراب هەڵات.» بە بیستنی ئەم قسەیە ڕۆستەم خاو ئەبێتەوە و ئەگەڕێتەوە. کە دێتە درگا، شا بە ڕێزەوە لەبەری هەڵئەسێ و داوای لێبووردنی لێ ئەکا و ئاشتی ئەکاتەوە. ئەو ڕۆژە بە شادی و بەزم و خواردنەوە ڕائەبوێرن و ڕۆژی دوایی لەشکر ئەڕازێننەوە و ڕێ ئەکەون.

لەشکری ئێران دێ ئەگاتە دژی سپی و بەرانبەر بە دژ ڕیز ئەبەسێ. ئەو شەوە ڕۆستەم بەرگی تورکان لە بەر ئەکا و بۆ بینینی سۆراب و لەشکرەکەی بە پەنامەکی ئەچێتە ناو لەشکرگای تورکانەوە. خۆی ئەگەیێنێتە مەجلیسی سۆراب و لە سووچێکی تاریکا ئەوێسێ. سۆراب لەگەڵ پاڵەوانانی توورانی گەرمی نۆشانۆشە. ڕۆستەم لە سەیری قەد و باڵای‌دا نوقم ئەبێ. لەو دەمەدا زەندڕەزم بۆ کارێ دێتە دەرەوە و چاوی بە ڕۆستەم ئەکەوێ. چون لەشکری تووران کەسی تیا نیە قەد و باڵا و قەڵافەتێکی وای ببێ، لی دڕدۆنگ ئەبێ و دەنگی ئەدا. ڕۆستەم بۆ ئەوەی کە ئاشکرا نەبێ، مشتێ لە ملی زەند ئەدا. زەند ئەکەوێ و ئیتر هەناسەی پیا نایێتەوە.

ڕۆژی دوایی سۆراب هوجیر لەگەڵ خۆی ئەباتە سەر تەپکێک بەرانبەر بە لەشکرگای ئێران. لەوێوە یەک بە یەک خەیمە و سەراپەردەی پاڵەوانان و گەورەیانی لەشکری ئێرانی پێ نیشان ئەدا و ناویان ئەپرسێ. هوجیر ناوی هەموویانی پێ ئەڵێ تا ئەگاتە ڕۆستەم. کە سۆراب سەراپەردەی ڕۆستەمی پێ نیشان ئەدا و ئەپرسێ: «هۆو پاڵەوانە خاوەنفەڕ و شکۆیە کێیە کە لەو سەراپەردە سەوزەدا لەسەر کورسیێک دانیشتووە و بە دانیشتنەوە لە هەرکام لەو کەسانەی کە لە لای وێساون بە ئەندازەی نیوەباڵێک بەرزترە؟» هوجیر ئەڵێ: «ئەوە پاڵەوانێکی چینیە. تازە هاتووەتە لای پاشا و ناوی نازانم. من لەم دژە بووم کە ئەو هاتە لای پاشا.» سۆراب لەوەی کە سۆراغی ڕۆستەم پەیدا ناکا زۆر دڵتەنگ ئەبێ و پاش ئەوەی کە لە پرس و جۆی لەشکری ئێران ئەبێتەوە، جارێکی‌تر ناوی ئەو پاڵەوانە مەزنەی سەراپەردە سەوزەکە کە لە لەشکرا کەس بە باڵای ئەو نیە و هیچ ئەسپێ وەک ئەسپەکەی ئەو نابێ، لە

هوجیر ئەپرسێتەوە، بەڵام هوجیر ڕاستی پێ ناڵێ. سۆراب هەڕەشەی لێ ئەکا کە ئەگەر ڕۆستەمی پێ نیشان نەدا ئەیکوژێ و بەڵێنیشی پێ ئەدا کە ئەگەر ئەوی پێ بناسێنێ، هەرچی لە ماڵی دنیا و پلە و پایە و ئاسایشت بیەوێ، پی ئەدا. هوجیر لە دڵی خۆیا ئەڵێ: «ئەگەر ڕۆستەمی پێ بناسێنم، لە ناو هەموو لەشکرا ڕوو لەو ئەکا و هەر شەڕ لەگەڵ ئەو ئەکا و بۆی هەیە کە بەم شان و باهۆ ئەستوورە و بەم ناوسینگە پانەوە کە بەم لاوە دلێرەوەیە ڕۆستەم بە دەسی بکوژرێ و تاج و تەختی ئێران بکەوێتە دەس دوژمن. نا، من بکوژرێم چاکترە.»

سۆراب هەرچی لەو پاڵەوانە مەزنە ئەفکرێ، ناونیشانەکانی دایکی تیا ئەبینێ و لە هوجیر دڕدونگتر ئەبێ. پی ئەڵێ: «ڕوستەمت پێ نیشان نەدام. چۆن ئەکرێ پاڵەوانێکی وەک ڕۆستەم لەم لەشکرەدا بێ و بەر چاو نەکەوێ؟ تۆ خۆت نەتووت سەرۆک و مەزنی هەموو لەشکرە؟» هوجیر ئەڵێ: «لێرە نیە و نایبینم. ڕەنگە ئێسا لە زابولستان خەریکی ڕابواردن بێ.» سۆراب ئەڵێ: «ئەمە هەر مەڵێ. شتی وا چۆن ئەبێ، شا شەڕێکی ئاوا سەختی لە پێش بێ و ڕۆستەم لەگەڵی نەیێ؟» هوجیر بۆ ئەوەی وورە بە سۆراب بەر بدا، ئەڵێ: «ڕۆستەم کەسێ نیە شێوەی ئەم جۆرە پاڵەوانانە بدا. خودا نەکا لە مەیدانا بەرەنگاری ڕۆستەم ببی...» و لەم بابەتە زۆر بە سەر ڕۆستەما هەڵئەڵێ. سۆراب قەڵس ئەبێ. بە پشتەدەس لی ئەدا و بە عەرزیدا ئەدا و بەتاو دێتەوە بۆ سەراپەردەی خۆی. بەرگی نەبەرد لە بەر ئەکا و دێتە مەیدان.

لە مەیدانا ئەگوڕێنێ و داوای هاونەبەرد ئەکا. پاڵەوانانی ئێران بە بینینی سۆراب بەجارێ ئەتۆقن و شپرزە ئەبن. هەر ناوێرن تیشی بڕوانن چ بگا بەوەی کە بچنە مەیدانی. سۆراب هەرا لە کاووس‌شا ئەکا و جنێوی پێ ئەدا و پاشان ئەنێتە لەشکری ئێران. لەشکر وەک ڕەوەیەک گۆڕ کە شێر تی نابێ لەبەر سۆراب ئەکشێتەوە و بڵاوە ئەکا. سۆراب پەلاماری سەراپەردەی کاووس شا ئەدا و لاییکی بە نێزە هەڵئەکەنێ. کاووس بانگ ئەکا: «دا کەسێ هەواڵ بەرێ بۆ ڕۆستەم. بڵێ پاڵەوانانی ئێران بەجارێ لەم تورکە تۆقیون و مێشکیان داتەکیوە. کەسم نیە بینێرمە مەیدانی. خۆی بگەیێنێ.» تووس هەواڵ ئەبا.

ڕۆستەم لە جوابا بە دڵمەندی و گلەیەوە ئەڵێ: «پادشایانی پێشوو که ئەیانناردە شوێنم، جارێ بۆ شەڕ بوو و جارێکیش بۆ بەزم و شادی بەڵام لە کاووس‌شا جگەد لە ڕەنجی شەڕ هیچم نەدی.» فەرمان ئەدا ڕەخش زین کەن. پاڵەوانانی ئێران لە حەیبەتا هەموو بە شپرزەیی تێئەووروو‌کێن، ڕەخش زین ئەکەن. ڕۆستەم کە ئەم پەشۆکاویەی پاڵەوانانی مەزنی ئێران ئەبینێ، سەری سووڕ ئەمێنێ. لە دڵی خۆی‌دا ئەڵێ: «چۆن ئەم قیامەتە هەر بۆ تاقە کەسێک بەرپا ئەبێ؟ وا نیە، ئەمە کاری ئەهریمەنە.» سوار ئەبێ و دێتە مەیدان و بەرەنگاری سۆراب ئەبێ. پاش هێندێک بە خۆدا هەڵووتن و تەوس و پلار لە یەک هەڵکردن، لەگەڵ سۆراب بڕیار ئەدەن کە هەر دوو بە دوو بجەنگن و نەهێڵن کەس بێتە یارمەتیان. لە لەشکر دوور ئەکەونەوە و نەدیوێ بۆ نەبەرد هەڵئەبژێرن.

پاش ئەوەی کە لە سەر داب و نەریتی مەیدان‌داری، زۆر بە خۆیانا هەڵئەڵێن و هەوڵ ئەدەن کە یەکتر بشکێننەوە، سۆراب ئەڵێ: «من پێم‌وایە تۆ ڕۆستەمی. ڕۆستەمیش نەبی، هەر لە بەرەی نەیرەمی.» ڕۆستەم ئەڵێ: «نە ڕۆستەمم و نە لەبەرەی نەیرەمیشم. ڕۆستەم پاڵەوانە و من بەندەی ئەوم. ئەو لە کوێ و من لەکوێ!» سۆراب بە یەکجاری ناهومێد ئەبێ و دنیای لە بەر چاو تاریک ئەبێ. تێک هەڵئەچن.

ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە لە مەیدانا بەرانبەری یەک ئەگەڕێن و بە چەکی جۆراوجۆر لە یەک ئەدەن و لە پشتوێنی یەکتر ئەنەون، هیچیان دەسیان ناکەوێتە سەر ئەوی دیکەیانەوە. چەند جار لە جەنگەی نەبەردا لە بەر مانوویی لە کار ئەکەون و دوورەپارێز ئەوێسن هەتا ئەحەسێنەوە و دیسان تێک‌هەڵئەچنەوە. جارێکیش وا لە دەس نەبەزی یەکتر وەڕەز ئەبن، ڕوو لەیەک وەرئەگێڕن و پەلاماری لەشکری یەکتر ئەدەن. ڕۆستەم لە کاتێکا کە نیشتووەتە ناو لەشکری توووران و خەریکی خوێن ڕشتنە، خورپە ئەکەوێتە دڵی کە نەکوو سۆراب زیان بە گیانی کاووس بگەیەنێ و تاج و تەختی ئێران بکەوێتە مەترسییەوە؛ بۆیێ بەکرژی ئەگەڕێتەوە و بەرەنگاری سۆراب ئەبێتەوە. بەم‌جۆرە هەتا ئێوارە لە یەک ئەدەن. ئەسپ و سواران لە کار ئەکەون

و زرێ و بەرگوستووان شڕ ئەبن بەڵام بێ ئەنجامە. کە هەوا تاریک ئەکا، لە یەک جیا ئەبنەوە و بڕیار دائەنێن بۆ زۆرانی ڕۆژی دوایی.

ئەو شەوە سۆراب دیسان بە هوومان ئەڵێ «ئەم پاڵەوانەی هاتووەتە مەیدانی من ئەبێ ڕۆستەم بێ. قەد و باڵا و قەڵافەتی ئەونە شێوەی من ئەدا ئەڵێی بە تەناف بە ئەندازەی یەک گیراوین. ناونیشانەکانی دایکمی تیا ئەبینم و دڵیشم زۆر بۆی دێنێ. شتی وا نەبێ، من لە ڕووی نائاگاداریەوە لەگەڵ ڕۆستەم دەسەو ئێخە بووبێتم!» هوومان دڵنیای ئەکا و ئەڵێ: «من لە مەیدانی شەڕا تووشی بو ـ وم و چاکی ئەناسم. ئەمە ئەو نیە. ڕەخشەکەی ئەو شێوەی ئەم ئەسپە ئەدا بەڵام ئەم ئەسپە تاو و گوڕی ڕەخشی نیە.»

ڕۆژی دووهەم کە ئەچنەوە مەیدان، سۆراب بە ڕووخۆشی و پێکەنینەوە لە حاڵی ڕۆستەم ئەپرسێ و دیسان پی ئەڵێ: «وەرە ئەم چەکی شەڕە فڕێ دە، با دانیشین پێکەوە و بە مەی ڕووی خۆمان بگەشێنینەوە. لێگەڕێ با کەسێکیتر بێتە مەیدان. دڵم زۆر بۆ تۆ دێنێ و شەرمت لێ ئەکەم.» بەڵام ڕۆستەم لە وەڵامدا ئەو ئەداتە بەر تەشەر و توانج و پی ئەڵێ: «وادیارە لە هەڵاتنی یان چونکە خۆت مناڵی پێت وایە منیش ئەونە خاوم کە بە دوو قسەی وا فریو ئەخۆم و دەست لە کۆڵ ئەکەمەوە. دوێنێ بڕیارمان لەسەر زۆران بوو نەک بەزم و مەی خواردنەوە.»

ئەسپەکانیان دوور ئەبەسنەوە و بە قەدی یەکا هەڵئەچن. سۆراب دەمودەس ڕۆستەم لە عەرز ئەدا و خنجیر هەڵئەکێشێ کە بیکوژێ. ڕۆستەم پەنا ئەباتە بەر مەکرێکی پیرانە و ئەڵێ: «داب و نەریتی ئێمە وایە کە هەرکات بۆ یەکەم جار پاڵەوانێکمان لە عەرز دا، نایکوژین. دیسان زۆرانی لەگەڵ ئەگرینەوە و کە دووهەم جار لە زەویمان دا، ئەمجار ئەیکوژین. سۆراب فریوی ئەم قسەیە ئەخوا و دەسی لە کۆڵ ئەکاتەوە بەری ئەدا. ئەوسا بێخەم سوار ئەبێ و ڕوو ئەکاتە دەشتەکە بۆ ڕاو. پاش ماوەیێک هوومان دێ بە سۆراغیەوە. سۆراب ڕووداوەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە. هوومان سەرسووڕ ئەمێنێ و پی ئەڵێ: «وا دیارە لە گیانی خۆت بێزار بو ـ وی! داخەکەم بۆ ئەو دەس و بازوو و شان و باهۆ و ناوسینگەت! شێرێکی وات خستە داو، کەچی بەرت دا و کارەکەت لە خۆت

تێکدا. جا بزانە لە نەبردێکیکەدا چیت بەسەر دێنێ و چۆن سەزای ئەم هەڵەیەت ئەداتەوە.»

ڕۆستەم کە ڕزگار ئەبێ، حیساب دێتە دەسی. لە ترسی گیانی خۆی و لە ڕقا وەک تیغێکی پۆڵا ڕەق ئەبێ. هۆ ئەزانێ مردووە و زینوو بووەتەوە. بە شێنەیی ڕوو ئەکاتە کانی و ئاوێ. ئاو ئەخواتەوە و خۆی فێنک ئەکاتەوە. ئەوسا ڕوو لە درگای خودا ئەکا و زۆر ئەپاڕێتەوە و داوای دەسەڵات و سەرکەوتنی لێ ئەکا و هەڵئەسێ، خەمبار و ڕەنگزەرد، دێتەوە بۆ مەیدانی نەبەرد.

سۆراب سەرگەرمی ڕاو و غارغارێنە و نەبەردی هەر لە بیریش نەماوە. بێخەم لەو دەشتەدا غارئەدا و هەو لە گۆڕان ئەکا. کە چاوی بە ڕۆستەم ئەکەوێ، پێئەکەنێ و بە تیتاڵیەوە پی ئەڵێ: «ها،چۆنی نەچیری لە دەس شێر ڕاکردوو؟»

ئەمجار کە تێک هەڵئەچنەوە، ڕۆستەم بە ڕقەوە دەس ئەبا شان و ملی سۆراب ئەگرێ و سووڕی بۆ دێنێتەوە. سۆرابی بەهێز و دلێر وەکوو ڕۆژگاردەسی بەستبێ، ئەنووشتێتەوە و ئەکەوێ. ڕۆستەم ئەزانێ هەلی وای بۆ هەڵناکەوێتەوە، دەرفەتی نادا؛ دەمودەس خنجێر هەڵئەکێشێ و بەرسینگی هەڵئەدرێ.

سۆراب ئاخێک هەڵئەکێشێ و ئەڵێ: «خۆم بە خۆمم کرد. گوناهی تۆی تیا نیە. ڕۆژم تەواو بووبوو. مەرگم بە دەس تۆ بوو. هەواڵانی من هێشتا لە کووچە وکۆڵانانا خەریکی کایە کردنن؛ من چی و مەیدانی شەڕ چی؟ دایکم ناونیشانی باوکمی پێدا، لە ئارەزووی دیداری ئەوا وەختەبوو گیانمدەرچێ. ئێساش تۆ کە ئاوا بە خوێن تینوویت و ئەو دەس و خنجێرەت لە خوێن هەڵکێشاوە، وا بزانە ڕۆژگار بە خوێنت تینووە. ئەگەر ببی بە ماسی و بچیتە دەریاوە یان ببی بە هەور و بکەویتە ڕووی ئاسمان، باوکم پەیدات ئەکا و تۆڵەی منت لێ ئەکاتەوە. کەسێ ئا لەم پاڵەوانانە هەر پەیدا ئەبێ کە هەواڵ بەرێ بۆ ڕۆستەم و بڵێ سۆراب کوژراوە و لە مەیداندا بێناز کەوتووە...» ڕۆستەم کە ئەمە ئەبیسێ، سەری سووڕ ئەخوا و لە تاسەوە ئەچێ. کە دێتەوە هۆش

خۆی، ئەڵێ: «چ نیشانەیێکی ڕۆستەمت پێیە؛ خودا ڕۆستەم لە ناو پاک کاتەوە؟»
ئەڵێ : «ئەگەر ڕۆستەم تۆیت وا بزانە بە بەدخوویی خۆت کوشتمت. بە سەد جۆر ڕێنوێنیم کردی، ڕیزەیێ مەیلت نەبزووت. دایکم پاڵەوانێکی خستبووە تەکم کە ڕۆستەمم پێ نیشاندا؛ ئەو کوژرا، بەختی منیش وەرگەڕا. مووروویێکیشی بەستووە بە باڵمەوە. ئەوا ئێسا بە کاری دێنم کە تازە بە کارم نایێ. بەندی زرێکەم بکەوە و بیبینە.» ڕۆستەم کە مووروەکە ئەبینێ، ئەدا بەسەر خۆیا و دەس ئەکا بە قوڕ پێوان.
لە لەشکری ئێرانەوە بیست کەسێ دێن بۆ هەواڵی ڕۆستەم. کە ئەبینن ئەسپەکەی بێخاوەن لەو دەشتەیە و خۆشی دیار نیە، هۆ ئەزانن کوژراوە. کرژ ئەگەڕێنەوە و هەواڵ ئەدەن بە کاووس. کاووس فەرمان ئەدا تەپڵ و شەیپوور لێ دەن و لەشکر بەتێکڕایی سوار بن. ئەڵێ: «بێت و ڕۆستەم کوژرابێ، تازە کەسی وام نیە بچێتە مەیدانی سۆراب، مەگەر لەشکر یەکجێ پێکەوە هێرش بەرن.» کە هەرا و غەڵەبە پەیدا ئەبێ، سۆراب بە ڕۆستەم ئەڵێ: «ئەم لەشکری تورکانە لەبەر من هاتو ـ ون بۆ ئەم شەڕە. ئێساش کە ڕۆژی من تێپەڕی، باری ئەوان پاک گۆڕدراوە. هەموو مێهرەبانییێکی خۆت بە کار بێنە و مەهێڵە شا شەڕیان لەگەڵ بکا و مەهێڵە زیانیان پێ بگا.» ڕۆستەم کرژ سواری ڕەخش ئەبێ و دێ بە فەرماندەرانی لەشکری ئێران ئەڵێ: «نابێ شەڕ لەگەڵ لەشکری تورکان بکەن.» ئێرانیان کە ئەبینن ڕۆستەم زینووە، هەموو بە ڕوودا ئەکەون و کوڕنووشی بۆ ئەبەن و زۆر سپاسی خودا ئەکەن. ڕۆستەم ئەمە ئەڵێ و بە تاو ئەگەڕێتەوە بۆ ژوورسەری سۆراب.
گەورەیانی ئێران لەگەڵی دێن. ڕۆستەم شیوەن ئەکا و قوڕ ئەپێوێ و یێخەی خۆی دائەدڕێ و لە خۆی ئەدا و خنجێر هەڵئەکێشێ کە خۆی بکوژێ. دەسی ئەگرن و دڵخۆشی ئەدەنەوە. گۆدەرز زۆری بەسەرا دێ و ئامۆژگاری ئەکا. ڕۆستەم بە گۆدەرز ئەڵێ: «بچۆ بۆ لای کاووس و پی بڵێ کە من چیم بەسەر هاتووە. لە زمانی منەوە پی بڵێ ئەگەر هیچ کار و کرداری منی لە بەر چاوە، لەو نۆشداڕووە کە لە خەزێنەیدایە و هەموو برینێک خۆش ئەکاتەوە،

هێندێکم لەگەڵ جامێ مەی بۆ بنێرێ.» گۆدەرز ئەچێ و پەیغامەکەی رۆستەم بە کاووس شا ئەگەیێنێ. کاووس لە وەڵامدا ئەڵێ: «کاری وا ناکەم. ئەگەر بێت و ئەم فیلەتەنە بمێنێ، رۆستەم پی پشت ئەستوور ئەبێ و ئەونەیتر دەسەڵات پەیدا ئەکا و تازە جوابی من ناداتەوە و بێگومان سەری من تیا ئەبا. ئەگەر ڕۆستەم تەنیا خۆی بێ، خراپەمان لەگەڵ بکا بە خراپە جوابی ئەدەینەوە بەڵام ئەم فیلەتەنە:

«کجا گنجد او در جهان فَراخ بدان فَرّ و آن بُرز و آن یال و شاخ»

واتە: «کوا ئەمە لە دنیای بەرینا جێگای ئەبێتەوە بەم فەڕ و شکۆ و بەم شان و باهۆ و هەیبەتەوە!»

گۆدەرز خێرا ئەگەڕێتەوە و ئەم وەڵامەی کاووس بە ڕۆستەم ئەگەیێنێ و ئەڵێ:«بەدخوویی ئەم پادشایە وەک دارێک وایە کە هەمیشە بەبەر بێ. خۆت بچۆ بەشکوو لی بسێنی.» ڕۆستەم ئەمر ئەکا بە خزمەتکارێ؛ ڕاخەرێک لە گوێی جۆگەئاوێک ڕائەخا. سۆراب ڕائەکێشێ و سوار ئەبێ کە بێ بۆ لای شا. هێشتا دوور نەکەوتووەتەوە کە کەسێک بە دوایا دێ و ئاگاداری ئەکا کە سۆراب تەواو بوو.

ڕۆستەم ئەگەڕێتەوە، دائەبەزێ و دەس ئەکا بە قوڕ پێوان و ماوەییەکی زۆر بە سۆزەوە سۆراب ئەلاوێنێتەوە و سەرکۆنەی خۆی ئەکا و نزا لە خۆی ئەکا. پاشان لە تابووتی ئەخا و ئەیباتەوە بۆ پەردەسەرای خۆی. ئاور لە پەردەسەرا بەر ئەدا و هەموو لەشکرەکەی سەر لە قوڕ ئەنێن. کاووس‌شا و گەورەیانی ئێران لەگەڵ ڕۆستەم لەسەر خاک و خۆڵ دائەنیشن و دڵخۆشی ئەدەنەوە. ڕۆستەم لەشکری توووران بەرەو دوا ئەنێرێتەوە و تابووتی سۆراب ئەباتەوە بۆ سیستان.

سەتر (٢٩٦): دێڕی نووسراوە، خەتی نووسراوە

سەد تۆکڵ (٥٣): کەسێکی کە رواڵەت و دەروونی یەکجار لە یەک جیاواز و لە یەک دوورە، کەسێکی کە یەکجار ریاباز و فێڵاویە و دەروونی خۆی ئەشارێتەوە

سەرا (٢٨٨، ٢١١): ماڵ

سەربزێوی (١٠٧): سەربزۆکی، یاخی بوون
سەر چەقاندن (٥٦): سەر تیا بردن، لە ناو بردن
سەرسام (١٦٦، ٩١): سەرگێژە، تێک چوون و بێخود بوون و وڕینە کردن و قسەی هەڵیت و پڵیت کردن بە هۆی نەخۆشیەوە
سەرسامی (٨٤): گرتنی نەخۆشی سەرسام، بڕوانە «سەرسام»
سەرسووڕ (١٦٤، ١٢١): واق ووڕ ماو، تاجب ماو. (متعجّب، حیران)
سەرکوێر (١٨٧): تێ نەگەیشتوو، کەسێک کە بە هۆی جاڕز بوونەوە هەڵە ئەبێ و لە فێر بوونا دائەمێنێ
سەرمردوو (٤٧): کەرسەگ، لە بنەوە بڕ، رواڵەت فەقیری بەدجسن.
سەرناسی (٥٣): سەر بە دەرەوەیی، شۆرەت و ناوبانگ
سەر نانەوە (١١١): خەوتن، بە خەم و خەفەتەوە خەوتن. بە مانای مردنیش هاتووە، وەک ئەڵێن: «ئاخری تۆ بەو ئاواتەوە سەر ئەنێیتەوە.» یانی ئەمریت و بەو ئاواتە ناگەی.
سەرە ڕۆیی (٩١): بێ فکر کردنەوە کار کردن
سەرین (٢٩٩): ژوور سەر
سەڕسەڕ (١٧١، ٦٤): بای ساردی بە تەووژم
سەقامگیر (٥٥): بەرقەرار، جێگرتوو. (مستقر، پایدار)
سەگ خاوەنی خۆی ناناسێ (٩٧): یەکجار ئاژاوە و هەرکی هەرکییە، یەکجار چڕە و گوڕەیە
سەنگ (٢٩٠): ١. قورسایی، ٢. نرخ، ئەرزش، لێرەدا مانای دووهەم مەبەستە.
سەواد (٣٩): رەشایی، ئەو رەشاییەی کە دوای داچوون و ئاوا بوونی خۆر لە ئاسۆی بەری خۆرئاوادا پەیدا ئەبێ.
سەوداسەر (٢٩٧، ٢٩٠، ١٠٤): زۆر ئاشق و ئەویندار، کەسێکی کە لەبەر ئاشقی خەریکە شێت بێ.
سەودایی (٢٨٩): ئاشق، شێتی ئیشق

سەوە (٤٥): سەوەتە، بۆ تێ گەیشتن لە مانای شێعرەکە پێویستە خوێنەر بزانێ کە لە دێهاتی کوردەواری بۆ نیگاداری و پاراستنی جووجەڵە و بەرخ و کاژیلەی ساوا سەوەتە ئەکەن بە سەریانا.
سیخوار (٥٩): وورده سەهۆڵی نەرم کە لە هەوای زۆر ساردا لە ئاسمان ئەبارێ
سیخوڕ (٢٢٤): جاسووس
سیرێژ (٦٣): سیراج، شتێکە وەک پەنیر کە لە دۆی کوڵاو ئەگیرێ و کەشکی لێ ساز ئەکرێ. بەتەنیا یان لەگەڵ کەرە و پەنیر تێکەڵ ئەکرێ و بە نانەوە ئەخورێ.
سیڕە (٨١): جۆرێ دەنگ وەک دەنگی باڵی باڵندەی گەورە لە کاتی راخۆشینا یان دەنگی کەوش لە کاتی ڕێگا ڕۆیشتن بە سەر بەفر و سەهۆڵا.
سیزیف (١٦٣): لە ئوستوورە کۆنەکانی یوونان‌دا کەسێک بووە کە خودایان قەهریان لێ بەستووە و مەحکوومیان کردووە بەوە کە بەردەوام گاشە بەردێکی گەورە بە پاڵە پەسێ بەرێتە سەر دوندی کێوێک. بەردەکەش هەر کە ئەگەیشتە سەر کێوەکە دائەتلاوە و ئەهاتەوە داوێنی کێوەکە و سەر لە نوێ کاری سیزیف دەسی پێ ئەکردەوە.
سیلەی نیگا (٢٩٨): گۆشەی نیگا
سیمڕ سیمڕ (١٠٠) : مرخێش مرخێش، خۆ کوتان و شانەچرکێ کردن.
سیمورغ (٤٥): لە باوەڕی قەومە ئێرانیەکانا لە رۆژگاری کۆنا باڵندەیێکی ئەفسانەیی بووە کە زۆر گەورە و بەهێز و زانا و خاوەن فەڕ و غەیب زان بووە. هێلانەی سیمورغ بە بڕوای پێشینیان لە کێوی قاف بووە. (بڕوانە «قاف»). «عەنقا»ش لە فەرهەنگی عەربا بە نزیکە هەر باڵندەیێکی وەک سیمورغ بووە.
سی ووشک بوون (١٣١): سی ووشکە گرتن، مردن لە توونیان، سی ووشکە نەخۆشییێکی کوشەندەیە کە ئاژەڵ بە هۆی توونیێتی بەردەوامەوە تووشی ئەبێ
سێ (٣٣): سا، سێبەر
سێ و دوو کردن (١٥٩): فکر کردنەوە لە ئاکامی کار و قسە، هەڵسەنگاندنی قسە پێش ووتن
سێوک (٢٢): هێرەڵماسی، یێرەڵماسی، سێف زەمینی

## ش

شار بە دەر (٣٥): کەسێکی کە لە شار دەرکراوە.

شاز (٥٧): تاک هەڵکەوتوو، بێوێنە

شاژن (١٢٧، ٤٠): ژنی شا، ژنێک کە پادشا و فەرمانڕەوا بێت، (مَـلَکە)

شپرزە (٢١٦): پەرێشان، تێک چرژاو، پەرێشان حاڵ

شکەستە (١٢٩): شکاو، مرۆوێک کە رواڵەت و روخساری تێک چڕزاوە و رەنگی پیری و چرچی لێ نیشتووە

شلوێ (١٣٩): لێڵ

شۆخ (٣٢): جوانی رێک و پێک

شۆخی (٨٠): جوانی، لەباری، رێک و پێکی

شەبەق (٢٠٧،٣٩): رۆشنایی بەری ئاسۆی رۆژهەڵات و رۆژئاوا لە کاتی دەرهاتن و ئاوا بوونی خۆرا. (شفق)

شەبیخوون (٧٥): هێرشی لە ناکاو و خافڵگیرانە، شەبیخوون زیاتر لە تاریکی شەوا بەڕێوە چووە.

شەپۆل شەپۆلی ناگەزێ (١٣٩): شەپۆلی بە شەپۆلی ناگا، شەپۆلی لێ دەرناکەوێ، شەپۆل نادا.

شەتاو (١٨٨، ١٨٧): چۆماوی وەرزی، چۆماوی بەهاری

شەتڵ (٢٢٨): بنجی گیا کە لە شوێنێکا ئەیڕوێنن و پاشان هەڵی ئەکنن و ئەیبەن لە شوێنێکیترا بە دەس ئەیچێنن. (نشا)

شەفەق (١٨٣): شەبەق، بڕوانە «شەبەق»

شەقار (٧٨): شەق بردن، شەق بوون، قەڵەشی گەورە تێ کەوتن، لەت بوون،

شەقار بوون (٢٢٢): شەق بردن، شەق بەستن، دوو لەت بوون، لەت لەت بوون،

شەقە مشار (١٧٢): مشاری دووکەسی کە بۆ داهێنان و بڕینەوەی داری گەورە بە کار دێ

**شەکەت** (٨٠): مانوو، زۆر مانوو
**شەڵاڵ** (٣٦،٥١): تەڕ، تلیساوە، خووساو. بە تایبەت بۆ تەڕ بوون بە خوێن و ئارەق بە کار دێ.
**شەڵاو** (٣٩): شاڵاو، پەلامار، هەڵمەت
**شەنگە** (٧٥): مەبەست شەنگەی شاروێران یان «زنگەی شاوران»ە کە بە پای گێڕانەوەی شانامەی فیردەوسی یەکێک لە پاڵەوانان و دەسەڵات دارانی گەورەی ئێران بووە. من وای بۆ ئەچم کە زەنگە فەرمانڕەوای کوردستانی موکوریان و کورد بووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبێک کە من لەم بارەوە بە زمانی فارسی نووسیومە. هەر وەها بڕوانە ووشەی «گۆدەرز» لەم فەرهەنگۆکەدا.
**شەوارە** (٤٠): بڕوانە «بەشەوارە»
**شەوژەن** (٢١٩): شەوبەن، تیکە دارێ کە لە ناوەوە درگا و دەروازەی پێ دائەخەن. (کولون)
**شەوەزەنگ** (١٨٧): تاریکە شەو، شەوی ئەنگوستە چاو
**شەهێن** (١٣٣): شاهێن، باڵندەیێکی راوکەرە کە لە باز چکۆلەترە. (شاهین)
**شیاکە گلێن** ٢٠٦): قالۆنچەیێکی رەشە کە لە دەشتا ئەژی و بە بۆنی شیاکە و پیسیەوە دێ و کۆ ئەبێتەوە و شیاکە و پیسی خڕ هەڵ ئەدا و ئەیبا بۆ کونی خۆی. (جُعَل)
**شیر** (٢١٦، ٢١٣): شمشێر
**شیلاوک** (٢١٤): تیکە گۆشتێکە لە ناوسکی ئاژەڵا کە ووشکی ئەکەنەوە و هەوێنی پەنیری پێ دروست ئەکەن. (شیردان)
**شێلگیر** (١٧٣): بەردەوام لەسەر ئەنجام دانی کار و دوا کەوتنی مەبەست، دەس هەڵ نەگر لە کار و مەبەست. (دارای پشتکار)

## ع

**عاملاندن** (٥٥): راهێنان و تەعلیم دان و رام کردنی گیان لە بەری تۆڕ و وەحشی

عوود (٢٨٦): دارێکی بۆن خۆشە کە بۆ بەهرەمەندی لە بۆنەکەی ئەیسووتێنن
عەزرەت (٥٠): تاسە. لام وایە کە ئەم واژەیە لە حەسرەتەوە هاتووە. (حسرت)
عەلەم (٤٦): عەیب، ئیراد، نەخۆشی، ناساغی. «عەلەم دەرهێن» (٤٦): عەلەم لێ دەرهێنان یانی عەیب و ئیراد لێ گرتن. عەلەم دەرهێن واتە بە عەیب و ئیراد، کەسێکی کە بۆ عەیبی خەڵک ئەگەڕێ. (عیبجو)
عەوداڵ (٢٩٧): دەروێشی گەڕیدەی ڕەبەن،
عەوداڵی (١٨): رەبەنی و بێمەئوا و مەکانی و دەربەدەری

## غ

غەدرە ئازار (١٦٧): ئازار دان بە غەدر لێ کردن و فێڵ و فریو و ناپیاوی و خوێڕیگەری

## ف

فرە (٥٣): زۆر، گەلێ
فریزوو (٩٢): هەرێز، گیایێکی ناسکە کە بنجەکەی بە سەر عەرزا پان ئەبێتەوە و ئاژەڵ زۆری پێ خۆشە. ئەم گیایە لە هەر شوێنێکا بێ رەگاژۆ ئەکا و ئەتەنێتەوە تا ووڵات دائەگرێ. ئەڵێن «فڵانە شت وەک تووی هەرێز بڵاوە» یانی لە هەموو شوێنێک هەیە.
فەرەج (٢٩٥): گوشایش، کرانەوەی دژواری
فیتنەئاکار (٤٥): کەسێکی کە ئەونە جوان بێ یان ئەونە شاز و بێوێنە و سەیر بێ کە دیدار و ئاکار و رەفتاری ببێتە هۆی فیتنە و ئاژاوە.
فیز (٧٨): پۆز، دەمار، باری هەوایی، دەعیە
فیشاڵ لێدان (٥٣): خۆ هەڵکێشان، خۆ نواندن
فیلەتەن (١٠٨): زەبەلاح، کەسێکی کە جەستە و ئەندامی زۆر زلە

## ق

**قاپوور** (١٢٣): رووکەشێ یان قالبێکی رەق کە شتێکی لە بەر گرتووە. (پوستە، پوکە)

**قاخڵی** (٢٢): شملی، گیاییێکە لاسک درێژ کە گوڵەکەی ریشاڵێکی زەردی پێوەیە وەک زەعفەران وایە و بۆ جوانی ئەیکەن بە رووی کولێرەوە

**قاشوو** (٣٥): قاشوولە، قاشوولکە، لەتە شووشە کە منالی فەقیر کایەی پێ ئەکەن.

**قاف** (١٠٩، ٤٥): کێوێکی ئەفسانەییە کە پێشینیان باوەڕیان پی بووە و پیان وابووە لە کۆتایی و دوایین هێڵی زەوی هەڵکەوتووە و ئەونە بەرزە کە باڵا پیاوێک مەودای لەگەڵ ئاسمان هەیە و ئەڕوانی بە سەر هەموو زەوی‌دا.

**قامک پێکان** (٢٠٦): قامک کردن بە گەروودا بۆ رشانەوەی بە زۆر

**قاڵمە** (١٢٠): چەقە و هەرا

**قاوەڵتوون** (٧٤): کاتی بەیانی، نانی بەیانی

**قریوە** (١٤٩): هەرا و هوریا لە خۆشیان

**قڕ و قەپ کردن** (١١١): متەق نەکردن، دەم قووچاندن، قسە نەکردن

**قنگەلاشک** (١٦٢): دڕووی کنگر کە گەورە ئەبێ و ووشک ئەبێتەوە و ئەبێتە بابردەڵە

**قنە قن** (٨٣): رۆیشتنی کۆتر و کەو، لێرەدا بە مەعنای هەڵبەز هەڵبەزی گڕی مۆمە کە وەک رێگا رۆیشتنی بە قنە قن وایە.

**قنیات کردن** (٣٤): رابواردن بە رادەی کەمی بژیو و ددان بە خۆدا گرتن.

**قوتە** (٤٠): قوتە کردن، سەر کێشان و تەماشای دەور و بەر کردن

**قوڕقوشم** (١٠٣): کانزاییێکی رەنگ بۆری قورسە. (سرب)

**قولە زەنگ** (٢٦٨): قولە رەشە، مرۆوی رەش پێس

**قولینچک** (١٣٦، ٧٣): گۆشە، سووچ

**قۆز** (١٨٤، ٥٠): جوانچاک و رێک و پێک، بۆ پیاوان بە کار ئەبرێ.

**قۆزی** (١٨٣): جوانچاکی و رێک و پێکی

**قەبارە** (١٧): بارسایی، بارستایی، قیلەت. (ضخامت)

**قەبە** (٥٣): **نارێک، ناقۆڵا**
**قەپۆز** (١٠١): **لمۆزی سەگ و ئاژڵ و شتی وا، دەم و لووتی سەگ و شتی وا.** (پوزە)
**قەتماغە بەستن** (١٢٠): **توێژ خستنی برین، ڕەق بوونی سەری برین.** «**قەتماغە**»: **توێژی ڕەقی سەری برین**
**قەتیس** (٤٠): **بەر لێ گیراو، بەند کراو.** (محبوس)
**قەشمەر** (١٤٧، ٧٤): **قەشمەرە، چکۆلانەی قوت و ووریا و بە گاڵتە و پێکەنین**
**قەشە** (٢٢٣): **پیاوی ئایینی خاچ پەرەستان**
**قەقنەس** (٨٥): **قاقەناس، قوقنووس. باڵندەیێکی ئەفسانەیە کە ئەڵێن حەوت کون لە دەنووکی‌دایە و کاتێ ئەخوێنێ حەوت جۆر مۆسیقا لە دەنووکی دەرئەچێ. ئەڵێن قەقنەس کە پیر بوو و کاتی مردنی هات، هێندی پووش و پڵاش کۆ ئەکاتەوە و لە سەری هەڵئەنیشێ و بە حەوت مۆسێقا ئەخوێنێ تا ئاوور ئەگرێ و ئەسووتێ. ئەوساکە لە خۆڵە مێشەکەی جووجکە قەقنەسێک پەیدا ئەبێ و ئەژییێتەوە. لە کوردەواری‌دا قەقنەس مەسەلە بۆ سووتان، ئەڵێن: «ئەو نانە کەوتە تەنوورەکە و بوو بە قاقەناس.» یانی تەواو سووتا و بوو بە خەڵووز.**
**قەڵاتە** (١٦١): **گیشە، تایەی چکۆلە، کۆمەڵێ باقە گیا و شتی وا کە بە نیزام لە سەر یەک هەڵچنرابێ. «تایە» لە قەڵاتە گەورەترە و چەند قەڵاتە کە لە سەر یەک دابنرێ، ئەبێتە تایەیێک**
**قەڵب** (٢٩٠، ٢٨٧): **ناخالیس، خەوش‌دار، ناڕەسەن، ناجسن**
**قەڵبەزە** (٢٠٢): **شەپۆلی گەورە و توند، گوڕمی ئاو**
**قەڵغان** (٢٨٩، ١٠٧): **مەتاڵ، سپەر**
**قەیران** (١٨): **جەنگەی توند و تیژی نەخۆشی. ئێسا بۆ جەنگەی هەموو جۆرە گرفتێک بە کاری دێنن.** (بحران)

## ک

**کاکێشان** (١٢٢،٧٣): **ڕووناکاییێکە لە ئاسامانا کە لە شەوی ساماڵ و تاریکا ئەدرەوشێتەوە و وەک جاددە وایە.** (کهکشان)

**کاڵا** (٥٦): **کووتاڵ، شتی کڕین و فرۆشتن**

**کام** (٢٩٠): **ئاوات، ئارەزوو. «پێن بدا کام» یانی بە ئاوات و ئارەزووومان بگەیێنێ.**

**کامڕەوایی** (٢٠٨): **بە ئارەزووی دڵ ژیان، بە ئامانج و ئارەزوو گەیشتن.** (بڕوانە «کام»)

**کانزا** (١٠٣): (فلز)

**کانگا** (٢٢٠): **کان.** (معدن)

**کردەم کۆ ئەگرێ** (٢١٣): **کارم سەقامگیر ئەبێ، کارم بە ئاکام و نەتیجە ئەگا.**

**کسپە کسپ** (١٥٩): **تۆزانەوەی پێس بە سەرما**

**کفارە** (٢٤): (فوّارە)

**کفت** (٧١): **شەکەت**

**کڵ** (٢٩٤، ١٨٠، ٣٨): **کۆگاییێک ئاوردوو کە بۆ ئاور کردنەوە بە شێوەیێکی تایبەت لە سەر یەک هەڵی ئەچنن وابێ ژێرەکەی بۆش بێ و بای پیا بچێ بۆ ئەوەی ئاورەکە جوان بسووتێ، کۆگای ئاوور. «کڵی کوێرەوە بوو» یانی کڵێکی کە بە سەر یەکا رووخاوە و بۆشایی بنەکەی نەماوە و جوان ناسووتێ و دووکەڵ ئەکا.**

**کڵپە** (١٦٤، ٣٠): **دەنگی بڵێسەی ئاگر، بڵێسەی ئاگر، دەنگی بە تەوژم سووتانی دار و پەردوو**

**کوتان** (٣٥): **بە توندی هەڵپەڕین، بە توندی پا لە عەرز دان لە کاتی هەڵپەڕینا.**

**کوت و مت** (٤٧): **عەینەن، بە عەینی وەک...**

**کوت و کوێر** (٢٠٦،١٩٨): **چاو چکۆلەی ناشیرین، کەم بین، کەسێکی کە بە تەواوی نابینێ**

**کوتەی خوێن** (٥٢): (نبض)

**کوچک** (٣٩): **بەرد**

کوڕکوڕ (٧٤): باڵندەیێکە لە پێدەشتەکانا هێلانە ئەکا و لە کەو گەورەترە. قەتێ.
کوڕە حەیران (١٠٤): کوڕی ئاشق و ئەویندار و بەندەوار
کولەباڵتە (٦٢): ئۆویێرکۆت. (اورکت)
کوێرەوە بوو (٣٨): بڕوانە «کڵ»
کۆ (١٠٥) : قالۆنچەیێکی سەوزی گەورەیە کە لە دەشتا ئەژی و هەڵ ئەفڕێ. هەڵفڕینەکەی زۆر لە ناکاو و بێ ئامانج و کوێرانەیە بۆیێ خۆی بە چاوی ئاژەڵ و مرۆوا ئەدا و کوێری ئەکا.
کۆ (١٨١): جەم، جەمع. (جمع)
کۆ بە کۆ (١٤٣): کۆڵان بە کۆڵان
کۆ بە کۆ (١٦٥): کێو بە کێو
کۆپان (٦٠): کورتان، جل و بەڕی کەر، کۆڵ کێشان بۆ پاراستنی پشتی خۆیان لە سوان و بریندار بوون و بۆ ڕاست راوێسانی کۆڵەکەیان جلێک لە پشت ئەبەستن کە ئەوەش کۆپانی پێ ئەڵێن.
کۆپە (١٠٨) : کۆپارە، گرێی پشت ملی گا و کەڵ. گەورە بوونی کۆپارە نیشانەی بەهێزی کەڵ و گایە.
کۆخ (١٨٢): زنج، چارداخ، چادراخ،ماڵی چکۆلە و ناخۆش
کۆلیل (٤٣): چارەڕەشی زەلیل و جێگای بەزەیی.
کۆلیلی (١٨٠): چارەڕشی و زەلیلی و جێگای بەزەیی بوون
کۆڵەکەی حەننانە (٣٠٠): کۆلکە دارێک بوو کە پێغەمبەری خودا (د) کاتێ کە بۆ ئەسحاب ئەدووا پاڵی پێوە ئەدا. کاتێ کە مینبەرێکیان بۆ پێغەمبەر (د) دروست کرد و ئەو دارەی بە جێ هێشت، دارەکە هاتە زمان و لە دووری پێغەمبەر هاواری لێ هەڵسا.
کەپۆ (٥٥): لووت
کەتیرەبڕ (١٦٩): ئەو کەسەی کە کەتیرە ئەگرێ.(کەتیرە شیلەی گەونە. بڕوانە گوێنی)

کەروێشکە (٣٣): نووچ دان و شەپۆل دانی کۆڕە گیای بڵیند بە دەم باوە کە لە راکردنی کەروێشک ئەچێ.

کەژاڵ (٢٠٤): چاو کاڵ

کەساس (٥٠): کز و کەنەفت، بێوەزع

کەسک (٧٢): سەوز

کەشم و نەشم (١٢٣): ناز و عیشوە، بە ناز رۆیشتن

کەفچڕێن (٤٠): کەف کردوو، ئاو ئەگر بە گوڕم و بە هێز بێ کەف ئەکا. «کەف-چڕێنە چۆماوی رەگم» یانی رەگەکانم وەک چۆماوێکی بە گوڕم و بە هێز وایە.

کەڵک (٧٩): پێویستی، ئیحتیاج. «کەڵکم تێت ئەکەوێ»: ئیحتیاجیم تێت ئەکەوێ، پێویستیم پێت ئەبێ. «بێ کەڵک»: یانی شتێکی کە قەت ئینسان پێویستی پی نابێ، بێسوود. لێرەوە هاتووە کە کەڵک بە مانای سوودیش بە کار ئەبەن.

کەڵە: گەورە. «بۆرە و کەڵە» (٣٩): پیاوی بێ ناو و نیشان و پیاوی سەر بە دەرەوە (عام و خاص)

کەمەن (١٨٦): کەمەند. (کمند)

کەن و کۆسپ (٤٠): کەند و کۆسپ، چاڵی و بەرزی سەر رێگا، لەمپەر و بەرگری سەر رێگا کە بەرگری لە گەیشتن بە ئامانج ئەکا.

کەنەفت (٦٠، ٥٢): کەلەلا، زۆر حاڵ پەرێشان

کەوانە (١٧١): بڕوانە «کەوانە کردن»

کەوانە کردن (٤٨): گەڕانەوە و لادانی گوللە پاش دەرچوونی لە تفەنگ بە هۆی کەوتن لە شتێکی رەق. گوللەی کەوانە کردوو کوشەندەیە.

کەوشەن (١٤): سنوور. (حد، مرز)

کەوشەن تەنگ (٢٠٥): سنوور تەنگ. (محدود)

کەونارا (٦٥): کۆنینە، زۆر کۆن. (باستانی)

کەوە (٤٥): کەووو، رەنگی شینی تاریک. «کەوەی ئاسمان»: رەنگی شینی ئاسمان. (کبود)

**کەوەڕووبەند(٣٩)**: رووبەندی کەووو، روبەندی شینی تاریک. «کەوەڕووبەندی سەوادی شەبەق» یانی رەشایی بەری شەبەق کە وەک رووبەندێکی کەووو وایە. (بڕوانە «سەواد»)
**کەیل (٩٣)**: پڕ. «دەروون کەیل» (٩٣، ٣١): دڵ پڕ لە ئازار و خەفەت، یەکجار خەمبار.
**کیمیا (٢٩٠)**: شتێکی کە پێشینیان بۆی گەڕاون و پیان وابووە کانزا بێنرخەکان ئەکا بە زێڕ و زێو، ئیکسیر
**کێشەوە کردن (١٩٦)**: پەیتا پەیتا و بە دوای یەکا کێشان، پەیتا پەیتا گوێزانەوە
**کێوبڕ (١٢١)**: کەسێکی کە بە کێوا ئەڕوا، کەسێکی کە بە کێوا سەر ئەکەوێ، (کوهنورد)

## گ

**گاشە بەرد (١٠٣)**: بەردی گەورە
**گراوی (١٤١، ١٠٤)**: دڵبەر، ماشقە، یاری مێوینە
**گردوولکە (٧١)**: گردی چکۆلە، تەپک، تەپی چکۆلە
**گرژ هەڵبوون (٥٠)**: کووڕ بوونەوە و وێک هاتنەوەی لەش بە هۆی ئازارێکەوە.
**گریم (٥٠)**: فەرزم کرد، وام دانا
**گرێ پووچکە (٢٢٢، ١٣٠)**: گرێ کوێرە، گرێیێکی کە لە بەر توندی و ئاڵۆزی ناکرێتەوە.
**گڕکان (٢٠٥)**: بۆرکان، ئاگرپژێن. (آتشفشان)
**گزیر (١١١)**: پێشکار، بەردەسی کوێخا لە دێدا
**گزیکار (٢٩١)**: فێڵباز
**گژە گژ (٢٠٧، ٤٣)**: دەنگی با بە تایبەت کاتێکی کە بەردەوام دێ و پیاو بە دەنگەکەی وەڕەز ئەبێ.
**گڤە (٣٢)**: دەنگێک وەک دەنگی با یان دەنگی بەرد و گوللەی هاوێژراو یان دەنگی پوورە هەنگ

**گلێنەی چاو** (١٦٧): بیلبیلەی چاو، گۆی چاو
**گڵکۆ** (٨٢): گۆڕ، قەبر
**گڵەخۆرکە** (١٩٥، ٤٣): کرمی بن گڵ کە ئەڵێن خۆڵ ئەخوا و بە خۆڵ بەڕێ ئەچێ.
**گورزی گاسەر** (١٠٧): گورزی تایبەتی رۆستەم کە گوایە لە شێوەی سەری گا بووە
**گوروون** (٩٦): «گوروونی پێس» یانی دەرهێنانی پێسی لاشە بە بێ بڕین، داماڵینی پێسی لاشە.
**گوڕم** (١٨٨): تەوژم، تەکان. زەبر (شدّت، تکان، ضربە)
**گولی** (٤١): خۆرە، خۆرکە، نەخۆشییێکە کە ئەندامی لەش ئەخواتەوە و لە بەینی ئەبا. (جذام)
**گوڵشەن** (٢٩٨، ٤٣): گوڵزار، گوڵجاڕ
**گونجە** (٢٠٦): کونی ئاوەڕۆ
**گوێقوڵاخ** (٧٤): لە سەر هەست، گوێ تیژ کردوو
**گوێنی** (٦٢): گەون، دڕوویێکی ناسکە کە بە رووی عەرزا پان ئەبێتەوە و ووشکەکەی زوو ئاوور ئەگرێ و خۆش ئەسووتێ و لە رابوردوودا بۆ هەڵ کردنی ئاوور کەڵکیان لێ وەر ئەگرت. شیلەی گەون کە «کەتیرە»ی پێ ئەڵێن لە پێشەسازی‌دا زۆر کەڵکی لێ وەر ئەگیرێ.
**گۆ** (٢١١، ٢٠٥): تۆپ. (کرە)، «گۆی زەوی»: (کرەی زمین)، «گۆی خۆڵین»: زەوی، زەمین
**گۆدەرز** (٧٥): بە گوێرەی گێڕانەوەی شانامەی فیردەوسی یەکێ لە پاڵەوانان و پیاو ماقووڵانی گەورەی ئێران بووە کە عەشیرەدار و بە دەسەڵات و هەروا زانا و دنیادیو بووە و سەرۆکی ئەنجومەنی مێهستان (مهستان) بووە و لە هەڵبژاردن و لابردنی پادشایانا دەسی بووە. لە شەڕێکا کە لەشکری ئێران تێک شکاوە و فەرماندەی گشتی لەشکر کە تووس بووە، رای کردووە، گۆدەرزیەکان پایان چەقاندووە و دوژمنیان تەس داوەتەوە. لەو شەڕەدا حەفتا و هەشت کەس لە بەرەی گۆدەرز کوژراون. تەنانەت لێکۆڵەرانی غەیرە کوردیش دیانیان بەمەدا ناوە کە گۆدەرز کورد بووە. گۆدەرز یەکێکە لە پاڵەوانانی سەردەمی کیانی، من

لە سەر ئەم باوەڕەم کە بێگومان پادشایانی زنجیرەی کیانی و پاڵەوانانی ئەم سەردەمە هەموو کورد بوون چونکە ئەم پادشایانە و ئەم پاڵەوانانە ئەگەڕێنەوە سەر پارتەکان و پارتەکانیش کورد بو- ون.

گۆڕەپان (٦٥): زەوی تەخت

گۆگەڕۆک (٩٥) : (سیّارە)

گۆنگە (٦٤): لوولەی سواڵەت

گەدە (٢٨٥): ئاماژەیە بەو رووداوە کە جارێک بۆ ئازار دانی پێغەمبەری نازدار (د) گەدە و گیپاڵی ئاژەڵێک لە سەر بانەوە بەر ئەدەنەوە بە سەریا.

گەرا (٩٠): تووی چنگنە و مێش و مەگەز و مار و مێروو، هێلکەی نارەس کە لە ناوسکی مریشکدایە.

گەردوون (٨١،١١٤): جەهان، جیهان، عالەمی ووجوود. فەلەک، رۆژگار (کیهان، گیهان، جهان، فلک، سپهر، روزگار)

گەردەلوول (٤٣): گێژەڵووکە

گەڕ (٢٢٢، ٢٢٨): فێڵ، پیلان

گەڕۆک (١٤٩): کەسێ کە دایمە بە ووڵاتا ئەگەڕێ. (دورە گرد)

گەڕی هەڵپەڕکێ (٣٥): خولی هەڵپەڕکێ

گەزە دان (١١٣): گەزە گەزە، کایە کردن بە منداڵ،قامک بۆ دەمی منداڵ بەری کە بیگەزێ و نەشهێڵی بیگەزێ.

گەزەن (٢١٩): زیان و زەرەر، ئافەت

گەشکە (١٥٨): فێ، لە خۆ بوونەوە لە خۆشیان

گەلحۆ (٥٦): زەلامی دەبەنگ و ناتێگەیشتوو

گەڵاڵە (٤٠): (طرح)، «گەڵاڵە کێشان»: (طرح ریختن)، «گەڵاڵە کردن»: (طرح کردن، طرّاحی کردن)

«گەمارۆ دان» (٧٨) یان: «گەمارۆ دادان» (١٦٨، ١٣٨: پەلامار دان و هێرش کردنە سەر بە جۆرێ کە دەرفەتی هەڵاتن و راکردن لە تەرەف بسێنێ، لا لێ بڕینەوە.

گێژاو (١١٩، ٨٤): گەرداو. (گرداب)

گێژەن (٥٩): گێژ و خول، سووڕ و دەور

ل

لات بۆ شل کەم (١١٣): ڕێگەت بدەم ، لات بۆ چۆڵ کەم
لاترازکەی لێ ئەبەست (٥٥): یانی خۆی لێ لا ئەدا و دووری لی ئەکرد.
لاسار (٢٣): گوێ نەبیس
لاک (٤٣): کەلاک ، لاشەی مردارەوە بوو
لاڵانەوە (٩٧): لاڵ و پۆ بوونەوە ، بە زەلیلی پاڕانەوە
لانکەدز (١٣٠): دزێکی کە لە بەر دلڕەقی لە دزینی هیچ شتێک لا نادا ، ئەڵێن: «مناڵ بە لانکە و بێشکەوە ئەدزێ» یانی لە دزینی هیچ شتێک لا نادا
لف (١٢٥ ، ٤٩): هاوتا
لکەی بەر چاو (٥٥): کەسێ یان شتێکی زۆر ناخۆشەویست کە پیاو بە بینینی ژیانی لێ تاڵ بێ و چاوی بەرایی نەدا کە بیبینێ.
لوو (١٢٠): گرێی سەخت لە بن پێسا. (غدە)
لووت داژەندن (١١٩): سەر بەردانەوە و مات بوون کە نیشانەی بێدەماخی و ئازارە.
لووسکە (٤٨): لاوی بێموو ، لاوی شێوە ژن و حیز ،
لە باتی (١٦٤): لە جیاتی
لە بیر کران (١٨٨): لە بیر چوونەوە
لە بیر کردن (٢٢٧): فەرامۆش کردن ، لە بیر بردنەوە
لە کیس چوون (١٧٧): لە دەس چوون. (از کیس رفتن، از دست رفتن)
لە گوێنی (٤٦ ، ٣٢...): وەکوو ، چەشنی ، لە چەشنی.
لەمپەر (٤٠): بەرگر ، کۆسپ ، مانع. «لەمپەری باخ»: دیواری باخ ، پەرژینی باخ
لەنگەر (١٠٧ ، ٤٥): «لەنگەر گرتن»: وێستان و خاو بوونەوە لە کاتی ڕۆیشتنا. «بە لەنگەر»: بە ڕۆیشتنێکی ئارام و لە سەر خۆ ، بێ پەلە ، بە هێمنی.

**لەولاک** (٢٨٧): ئاماژەیە بەو حەدیسە قودسییە کە روو بە پێغەمبەری خودا (د) ئەفەرمێ: «لَولاکَ لَمـّا خَلَقتُ السَّموات و الأرض» واتە ئەی موحەممەد ئەگەر تۆ نەبواییێ ئاسمانەکان و زەویم نەئەخولقاند.
**لیخن** (١٠٥): ئاوێک کە لە بەر زۆر مانەوە خڵتە و قەوزەی گرتبێ و شلوێ و بۆگەن بووبێ.
**لێ بڕان** (١٦٨): ساغ بوونەوە لە سەر کردنی کارێک. (تصمیم گرفتن)
**لێڕەوار** (١٨٧): دارستان، جەنگەڵ
**لێشاو** (١٨٧): جەریانی ئاوی زۆر
**لێڵایی** (١٨٠): کوێری، «لێڵایی داهاتن»: کوێر بوونی چاو
**لێ هەڵکڕان** (١٣): لێ بە دەس هاتن، لێ دەس کەوتن

## م

**مالۆس** (٤٧): بەرازی مێو
**ماڵۆچکە** (٦٢): ماڵی چکۆلە
**ماوەڕا** (٢٠٦): ئەو دیوی شتێک، ئەو لای شتێک
**مایداس** (١٦٣): لە ئوستوورە کۆنەکانی یوونان‌دا کەسێک بووە کە زۆر هۆگری ماڵ و سامان بووە، بۆیە خودایان قەهریان لێ بەستووە و هێزێکیان پێ داوە کە دەس لە هەر شتێک بدا ئەو شتە ببێ بە زێڕ. مایداس پاش ماوەیێک کە بەم هێزەوە ئەژی، جاڕز ئەبێ و پەشیمان ئەبێتەوە چونکە دەس لە هەر خواردەمەنییێک ئەدا ئەبێ بە زێڕ و چی‌تر خۆراکی پێ ناخورێ و تەنانەت دەس لە لەشی کچکەشی ئەدا کچەکەی ئەبێتە پەیکەرێکی زێڕین.
**مجرۆ** (٢١٦): کەسێ کە بە هۆی برینداری یان ناتەواوی لەش و کەمئەندامی بکەوێتە زەوی. (زمینگیر)
**محاڵ** (٥٧): ناوچە، کۆمەڵە ئاواییێکی سەر بە یەکتر، وەک ئەڵێن: محاڵی شاروێران، محاڵی مەنگوڕایەتی
**مخابن** (٤١): مەخابن، مخابەند، حەیف، بەداخەوە، ئەفسووس

مخابەند (١٠٠): مخابن، مەخابن، حەیف، بەداخەوە، ئەفسووس
مده (٣٩): مووددەت، درێژایی. «بە مدەی عومرم» یانی بە درێژایی تەمەنم.
مراز (٤٦): نیازی دڵ، مراد.
مشتوو (٢١٣): دەسکی شیر و خنجێر و شتی وا
مشقە مشق (١٠٠،٣٠): هەژان و هەڵچوون لە خۆشیان، (بن زاراوەی فەیزوڵڵابەگی)
مقۆمقۆ (٩٦): مشت و مڕ، چەقە و گوڕە
ململانێ (٣٩): رکەبەری. (رقابت)
ڵمەما (٣٨): بابوێر، کەلێن و کولۆرێک کە بای پێدا بێت. (منفذ)
موڵ و مۆ (٢٢١): ئەوەیە کە سەگ و شتی وا بە بۆن کردن بۆ شت ئەگەڕێ، چنۆکە چنۆک
مۆر (١٠١): قاوەیی رەنگ، خۆڵینە رەنگ
مۆڵگە (١٣٢): شوێنی مۆڵ خواردن، شوێنی مانەوە و حەسانەوە. (محل اتراق کردن)
مۆم (١٨٢): شەم. (شمع)
مۆن (٤٧): رووگرژ، مڕ و مۆچ، ناوچاو تاڵ،
مەتاڵ (٢١٩): قەڵغان، سپەر
مەڕاق (٢٨٨، ٢١٠): حەز و ئارەزوو
مەرهەم (١٧٨): دەرمانی تێ هەڵساوین، هەتوان. (مرهم)
مەستە خەسار (١٨٥): کولۆڵ، بەدبەخت، ماڵوێران
مەعازەڵڵا (١٥٠): هەر هیچ، ئەسڵەن، یەک زەڕڕەش
مەعجووم (١٧٨): ماجووم، تێکڵاو کراوی چەند دەرمان بۆ مەڵهەم. (معجون)
مەکینە (٢٤): ماشێن، (ماشین)
مەلا (٤٧): مەڵڵا، سەردەسەی مناڵان لە کاتی کایە کردنا.
مەڵاز (١٦٢، ١٠٦): خۆ بە زەمینەوە چەسباندن و چاوەڕوانی دەرفەت بوون
مەڵبەند (٣٥): ناوچە، مەنتیقە، سەرزەوی، شوێنی ژیان
مەندی (١٩٤): ئارامی، پشوو لە سەر خۆیی، بێ هەڵپە و پەلەیی، بێبزاوی

مەودا (١٠٠): ماوەی بەینی دوو شت. (فاصله)
مەیسەر (٥٥): جێ بە جێ، مومکین. ئەڵێن: «فڵانکەس مەڕامی مەیسەر بوو.» یانی ئەوەی کە ئەیویست پی گەیی. (میسّر)
مەیین (١٦٠،٨٣): گرسان وەک گرسانی ماست و پەنیر، سفت بوون و لە جەرەیان کەوتنی شلەمەنی
مەییو (١٦٠، ١٠٠): گرساو، لە جەرەیان کەوتوو
میسۆنێر (٢٢٣): راگەیێنەر و پڕوپاگەندەچی ئایینی خاچ پەرستی (مبلّغ مسیحی)
مینا (٧٤): شووشە کە لە زوودا بۆ رازاندنەوە کەڵکی لێ وەر گیراوە و بە قیمەت و نایاب بووە.
مێرغوزار (٣٦): شوێنی سەوزەڵانی و پڕ گیاو و لەوەڕ، مێرگ
مێ مەکری (١٦٧): حیلە و مەکری مێیانە، حیلە و مەکری ژنانە

ن

ناباو (٢٧١): کردەوە و ئاکارێ کە لە ناو خەڵکا داب نەبێ و برەوی نەبێ
ناتۆر (٢٧١): ناونیتکە، لەقەمی خراپ
ناتەبا (١٩٩): پێکەوە نەساز، موخالیف،
ناخ (١٠٤، ٤٠): دەروون، قووڵایی ناوەوەی شتێک، قووڵایی دەروون
ناسۆر (٥١): برینی تەشەنا کردوو، برینی کۆن کەوتوو و خۆشەوە نەبوو
نامۆ (١٠٢): بێگانە، غەریب، خوو پێ نەگرتوو
ناڵەشکێنە (٧١): ناوی کێوێکی بەناوبانگە کە بە تەنیشت شاری بۆکانەوەیە و ئەڕوانێ بە سەر ئەم شارەدا.
نامۆیی (٧٨): غەریبی، بێگانەیی، خوو پێ نەگرتوویی
نزا (٧٧): دووعای خراپ، نەفرین. (نفرین). ئەو کسانەی کە واژەی نزا بە مانای موتڵەقی دووعا یان بە مانای دووعای چاکە بە کار دێنن سەخت هەڵە ئە کەن. (بۆ روون بوونەوەی زیاتر بڕوانە «هەرە».)

نشێو (٣٦): نزمایی
نفووس (١٨٧، ٥٥): وودمی دیدار و قسەی کەسێک، بەرەکەت یان شوومی دیدار و قسەی کەسێک. ئەڵێن: «فڵانکەس نفووسی پاکە هاتە لام نەخۆشیەکەم چاک بووەوە.» یان: «فڵانکەس نفووسی خراپە هاتە لام کارەکەم تێک چوو.»
نواڕی (٤٧): روانی
نوغرۆ بوون (٢٠٩): نوقم بوون، رۆ چوون
نووچ دان (٤٩): نووشتانەوە، چەمانەوە وەک چەمانەوەی دار و درەخت یان چەمانەوەی کەسێک کە بە سەر پاوەیە و لە حاڵی رێگا رۆیشتنایە.
نوێنگە (٩١): شوێنی دەرکەوتن، (مظهر)
نەبەرد (٧٨): دلێر، ئازا، جەنگاوەر
نەبەرد (١٧٣، ١٢٤، ١٢٢، ١٠٥): لێک دان، جەنگ، شەڕ، خەبات
نەرم و نیان (٧٣): بنیادەمی ئەهوەن و ئارام و لە سەر خۆ و دڵگر
نەسخ (٢٨٩): باتڵ بوونی ئایینە کۆنەکان بە هاتنی دینی پیرۆزی ئیسلام
نەغمەخوانی (١٩٤): ئاواز خوانی، گۆرانی ووتن
نەگریس (١٢٠): بەدفەڕ، خراپ
نهێنکاری (٢٢٥): مەخفی کاری
نهێنی (١٠٠، ٥٧): راز، سیرڕ، شتی شاردراوە و کەس پێ نەزان. «بە نهێنی» (٦٥): بە پەنامەکی، مەخفیانە
نیاز (٢٩٣): قەست، مەبەست (قصد)
نیر (٤٣): دارێکی کە ئەیخەن بە سەر ملی دوو گادا و ئامووری جووت کردن و شتی وای پێوە ئەبەسن.
نێرک (٢١٨، ١٩٨): لاسکی سەرەکی و توندی ناوەراستی گیا، تەوەرەی دەسار و چەرخی ئەرڕابە و شتی وا
نێرینە (٧٩): «نێرینەی ئاو»: جێگەی هەرە قووڵی ئاو، ناوەڕاستی ئاو
نێڵ دان (٢٩٠): بڕوانە «نێڵە»
نێڵە (٣٠): گڕی بە تەووژمی ئاوور، گڕی خۆش کراوی ئاوور. «نێڵ دان»: خۆش کردنی ئاوور، بۆش کردنەوەی کڵی ئاوور بۆ ئەوەی با بچێ بە ژێریا و خۆشتر

بسووتێ. «نێڵ» یان «نوێڵ»: دارێکی درێژ یان شتێکی وا کە ئەیکەن بە ژێر کڵێ ئاوورا بۆ ئەوەی بۆش بێتەوە و خۆشتر بسووتێ یان ئەیکەن بە ژێر شتێکا بۆ ئەوەی لە عەرزی بەرز کەنەوە.

نێوبردە کردن (١٠٦): بە ناو و ناونیشان جنێو بە کەسێک دان

نێوجێیی کردن (١١٠): نێوبژی کردن، لە یەک جیا کردنەوەی ئەو کەسانەی کە پێکەوە شەڕ ئەکەن

## و

واتا (٢٧٣، ١٣٢): مانا، مەفهووم. (بۆ باریک کردنەوە و دیققەت دان بە واژەکان چاک وایە بە «معنی» بڵێین مەعنا یان مانا و بە «مفهوم»یش بڵێین واتا. ئەم دیققەت دانە لە زۆر واژەیتریشا پێویستە، بۆ وێنە وا چاکە واژەی «هۆنراوە» یان «هۆنە» بەرانبەر بە «نظم» و واژەی «شێعر» بەرانبە بە «شعر» بە کار بێنین.)

وارەستە (٢٢٢): دەس لە دنیا بەرداو، کەسێ کە دڵبەندی بە دنیاوە نیە

واریس (١٨٧): میراتبەر، میراتگر

واقووڕ مان (١٠٧): سەر سووڕ مان، تاجب کردن، حەیران بوون

ووت و ویرە (٢١٣، ٤٦): لە دڵی خۆدا قسە کردن، نوقمی فکر و ووت و وێژی دەروونی بوون.

ووتە داکەوت (٥٥): دەنگۆ ساز بوو، شایەعە ساز بوو، ووتی ووتی پەیدا بوو

ووڕە بەرداو (١٨٢): کوڵکە بەرداو، لیباسێک کە لە بەر کۆنی پرزە و ریشاڵی هەڵدابێ. (لباس نخ‌نما)

ووزە (٢٠٢): تاقەت، توانا

ووزە هەڵنەگر (٥٣): لە ووزە و تاقەت بەدەر. «ووزە»: تاقەت، توانا.

## ه

**هان** (١٣١): پاڵ پێوه نەر، هەستێک کە پاڵ بە ئینسانەوە ئەنێ بۆ کردنی کارێک. (انگیزە، داعیە)

**هانا** (٢٠٤،٨١): تین، گەرمایی. «هانا بردن» بە مانای هاوار بردن و پەنا بردنیش هاتووە، ئەڵێن: «هانای برد بۆ فڵانکەس لەو روڵمە رزگاری کا.»

**هاونەبەرد** (١٠٦): حەریف، لایەنی شەڕ

**هزر** (١٢): فکر. («بیر» بە مانای فکر نیە بەڵکوو بە مانای یادە. ئەگەر «بیر» بە مانای فکر بەکار بێنین، ئەی بۆ مانای یاد چی بکەین و چە واژەیێک بە کار بێنین؟ کە وایە بە کار هێنانی «بیر» لە جێگای «فکر» غەڵەتی مەشهوورە و لە زمانی ئەدەبا تا ئەو جێگەی ئەکرێ ئەبێ خۆی لێ لادەی. هەڵبەت لە زمانی خەڵکا هەیە کە ئەڵێن: «ئەونە سەرۆیی مەکە، تۆزێ بۆخۆت بیر لە دنیا بکەوە، بزانە دنیا چۆنە.» ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەی ئەبینی «بیر» لێرەدا لە مانا سەرەکیەکەی خۆی زۆر نزیکە؛ «بیر لە دنیا بکەوە.» یانی بیرەورەیەکان و ئەزموونەکانی خۆت یاد بکەوە و بیهێنەوە بەر چاوت. ئائەونە کە لە زمانی خەڵکا هاتووە، بە کار هێنانی رەوایە بەڵام رەوا نیە لە هەموو جێییێکا «بیر» لە جیاتی «فکر» بە کار بێنی. بۆ بە «عقیدە» ئەڵێی «بیر و باوەڕ» هەر بڵێ «باوەڕ» و ئاە. بۆ ئەڵێی «بە بیر و ڕای من» هەر بڵێ «بە ڕای من» و تەواو.)

**هورووژم هێنان** (٨٩): ڕوو تێ کردن و پەلامار دانی بە کۆمەڵ

**هوڵم** (١٩٤): هەڵم، بۆق، بوخار

**هۆدە** (٦٥): دیو، ژووری ماڵ

**هەپروون** (٥١): وورد و خاش، لەت و کوت

**هەتوان** (٢٩٧، ١٧٨): مەڵهەم، مەڵحەم، دەرمانێ کە لە برینی ئەساون. (مرهم)

**هەتەر کردن** (٢٠٣، ١٥٠): بینین، تەشخیس دان، بڕ کردنی سۆمای چاو. «چاوم هەتەری لێ ناکا»: یانی نایبینم، بۆم تەشخیس نادرێ. «هەتا چاو هەتەر ئەکا»: هەتا ئەو جێگای کە چاو ئەبینێ و بە چاو تەشخیس ئەدرێ. وای بۆ ئەچم کە هەتەر مانایێکی تایبەتی ببێ. لە هەلاوە مەلاوەی نەورۆزا ئەڵێن:

«هەتەرێ مەتەرێ، شتێکم بۆ بخەنە بن چەپەرێ...» ڕۆشن کردنەوەی مانای دەقیقی ئەم واژە پێویستی بە لێ کۆڵینەوەیێکی زیاتر هەیە.

هەدا دان (٥١): ئارام گرتن، سرەوتن، داسەکەنین

هەرا (٤٥): بانگ، بانگ کردن، هاوار کردن. (ندا)

هەرد (٤١، ٢٤): عەرد، عەرز، ئەرز، زەوی، زەمین

هەرد و دیار (٧٨): هەرد و مەکان،ووڵات، دەور و بەر تا ئەونەی کە دیار بێ یان تا ئەونەی کە ئاگای لێ بکرێ

هەرەپیاو (٩٥) : کەسێ کە لە هەموو کەس پیاوترە. (اَبَرمرد)

هەرە (٢٧٢):

هۆشیار کردنەوەیێک: «ترین» کوردی نیە. مەبەستم ئەو پاشبەندەیە کە ئاوەڵناو یان سیفەتی عالی پێ ساز ئەبێ. ئاوەڵناو یان سیفەت سێ دەرەجەی هەیە: ئاسایی، تەفزیلی، عالی. سیفەتی ئاسایی نیشانەیێکی تایبەتی نیە. نیشانەی سیفەتی تەفزیلی لە کوردیدا «تر» و لە فارسیدا «تەر»ە. بۆ وێنە لە کوردیدا ئەڵێن: «ئەمە چاکە بەڵام ئەمە چاکترە.» یان لە فارسیدا ئەڵێن: «این بد است ولی این بدتَر است.» ئەم وەک یەک چوونەی زمانی کوردی و فارسی لە نیشانەی سیفەتی تەفزیلیدا بووەتە هۆی ئەوە کە نووسەرانی کورد هەڵەیێکی گەورە بکەن. ئەو هەڵەیەش ئەمەیە کە پیان وایە نیشانەی سیفەتی عالیش لە کوردیدا هەر وەک فارسی وایە بەڵام وا نیە. نیشانەی سیفەتی عالی لە فارسیدا «تەرین»ە، وەکوو ئەڵین: «این بدتَرین است.» یانی لە هەموان خراپترە. بەڵام لە کوردیدا ناڵێن «ئەمە خرابترینە.» ئەڵێن: «ئەمە هەرە خراپەکەیانە.» یان ئەڵێن: «ئەمە خراپە خراپەکەیانە.» سیفەتی تەفزیلی لە کوردیدا بە «تر» ساز ئەکرێ بەڵام سیفەتی عالی بە «ترین» ساز ناکرێ بەڵکوو بەم دوو شێوە ساز ئەکرێ: بە «هەرە» یان بە دووبارە کردنەوەی سیفەتە ئاساییەکە، کە وایە ئەڵێن: «هەرە خراپ» یان ئەڵێن: «خراپە خراپەکە.» سەرنج بدە پیرە پیاوێکی نەخوێندەواری لادێی کوردەواری هەرگیز سیفەتی عالی بە «ترین» ساز ناکا. چاک وایە نووسەرانی کورد ووریای ئەم

مەوزووعە بن چونکە ئەگەر هەزار واژەی لاوەکی بخزێتە ناو زمانەوە بە قەد ئەوە زیانی نیە کە قاعیدە و پێرەوێکی رێزمانی بێگانە بێتە ناو زمانەوە.

هەڵەی‌تریشمان لە زمانی ئەدەبی کوردی‌دا زۆرە کە بە هۆی کەم تەرخەمی نووسەرانی رابووردوومانەوە کەوتوونەتە ناو زمان. ئێرە جێگەی باسی ئەم مەوزووعە نیە و خودا یار بێ و ئەجەل دەرفەت بدا لە جێگەی خۆی‌دا باسێ ئەم شتانە ئەکەم. ئەم مەوزووعە هەڵگری ئەوەی هەیە کە کتێبێکی سەربەخۆی لە سەر بنووسرێ. لەم فەرهەنگۆکەدا لە چەن شوێنا باسی هێندێ لەم هەڵانەم کردووە و ئەوا لێرەشا بۆ نموونە سێ چوار دانەی‌تر باس ئەکەم: بووەتە باو ئەڵێن: «فڵانکەس سەبارەت بەو شتە دووا.» ئەمە هەڵەیێکی زۆر زەقە. بۆ ناڵێی «لە بارەی ئەو شتەوە دووا.»؟ «سەبارەت» یانی «بە خاتری»، «لە بەر خاتری.» گۆرانییێکی بە ناوبانگ هەیە ئەڵێ: «سەبارەت بەو چاوانە من لەم دێیە میوانم.» یانی لە بەر خاتری ئەو چاوانە. هەڵبەت لەم مانا سەرەکیەوە مانایێکی‌تریش بۆ ئەم واژە هاتووە کە نزێکە لە ماناکەی هەوەڵ، وەک ئەڵێن: «بۆ رێزێ فڵانکەس ناگری؟ بزانە ئەو سەبارەت بە تۆ چەنی چاکە کرد.» یانی نیسبەت بە تۆ چەنی چاکە کرد. دەرهەق بە تۆ چەنی چاکە کرد. کوا، کەی نەخوێندەواری لادێی کوردەواری ئەڵێ: «سەبارەت بەو شتە دوا» یان: «سەبارەت بەو شتە گفت و گۆیان کرد.»؟

هەڵەیێکی‌تر ئەوەیە کە «نزا» بەرانبەر بە «دووعا» بە کار دێنن. بۆ نموونە ئەڵێن «نزا و پاڕانەوە لە درگای خودا» سەرنج بدە نەخوێندەواری لادێی کوردەواری ئەگەر مەبەستی دووعای چاکە بێ، قەت ناڵێ «نزام کرد.» یان «دووعا و نزام کرد.» بەڵکوو نزا تەنیا بۆ دووعای خراپ بە کار دێنێ، وەک ئەڵێن: «ئەو ژنە هەر دووعا و نزا لە مناڵەکانی ئەکا.» کە وایە «نزا» بە مانای دووعای خراپ یان «نەفرین»ە.

هەڵەیێکی زۆر زەقی‌تر ئەوەیە کە «راوێژ» بە مانای مەشوەرەت و ڕا گۆڕینەوە بە کار دێنن. پیان وایە «ڕا» لێرەدا بە مانای فکر و بۆ چوونە و راوێژ یانی ئەوە کە رای خۆت بێژی و رای خۆت دەر ببڕی کەچی وا نیە. «راوێژ» واژەیێکی کۆنە و لە بن زاراوەی خەڵکی ناوچەی فەیزوڵڵابەگی‌دا بە مانای شێواز و تەرزی قسە

کردن به کار ئەبرێ. ئەڵێن: «فڵانکەس راوێژی دەمی ئەونە خۆشە، پیاو هەر حەز ئەکا گوێ لە قسەی بگرێ.» کە وایە «ڕا» لێرەدا بە مانای رێگە و رەوشە و راوێژ یانی چوونیەتی و شێوازی قسە کردن و قسە وێژان و دووان. ئەم واژە پڕ بە پڕ بۆ ئەوە باشە کە بە مانای «سبک» لە رەخنەی ئەدەبی و هونەریدا بە کار بهێنرێ. لە کوردی رەسەنا بە مەشوەرەت کردن ئەڵێن «پرس و ڕا کردن». کە وایە بۆ مەشوەرت چاک وایە لە جیاتی راوێژ بڵێین: «راپرس» یان «راوپرس». ئەکرێ واژەی لێکدراویشی لێ ساز کەی، بۆ نموونە ئەکرێ بڵێی «راپرسکاری» یان «راوپرسکاری». لەوە ئەچێ ئەو کەسانەی کە واژەی «راوێژ»یان بە مانای مەشوەرەت داتاشیوە، نەیانزانیبێ کە ئەم واژە پێشتر بە مانایێکیتر لە زمانی کوردیدا هەبووە یان هەر ئەو واژە کۆنەیان بیستووە و بە هەڵە تی گەیوون.

هەڵەییێکی زۆر زەقیتر ئەوەیە کە «ئەرک» بە مانای «وظیفە» بە کار دێنن. «ئەرک» لە زمانی رەسەنی کوردیدا بە مانای «زەحمەت»ە. کورد ئەڵێ: «فڵانکەس هەموو ئەرکێکێ بە سەر منەوەیە» یانی هەموو زەحمەتێکی. یان ئەڵێن: «بە خودا فڵانی ئەرکی گرانە.» یانی زەحمەتی زۆرە.

کاتێ کە هەر کۆلکە نووسەرێکی ناشارەزا لە جێگای خۆیەوە دەس ئەکا بە واژە داتاشین، زمانی ئەدەبی تووشی ئەم چەشنە ئافەتانە ئەبێ. نووسەرانی شارەزا و ئەدیبانی زماناس ئەبێ بەردەوام پاسەوانی زمان بکەن و ئەم هەڵانە بپاڵێوون. خۆزگە عەلاقەمەندانی زمان و ئەدەبی کوردی لە جیاتی ئەم حیرسی واژە داتاشینە کە تووشی بو ـ ون و بە شانازی ئەزانن، لاییێکیان لە زمانی خەڵک بکردایێتەوە و بەتایبەت روویان لە ئاواییە دوورە شارەکان بکردایێ و واژەی رەسەنی کوردییان لە زمانی خەڵک وەرگرتایێ.

هەژگڵ (١٢٣): هەژگەڵ، لقەداری ووشک، پووش و پڵاش

هەژین (٩٦، ٢٧): راژان، راتەکان

هەسیان (٤٦): وە ئاگا هاتن، هۆشیار بوونەوە، بە هەست هاتن.

هەقی پێ کرد (٤٤): دەرەقەتی هات، چاری کرد.

هەگبە (٨٤): هەمانە

هەڵاو (٤٠): هاڵاو، تینی گەرما، تینی ئاوور
هەڵاوێزران (٨٩): وە لا نران، لە ریز دەرکران. (مستثنی شدن)
هەڵپساندن (٤٧): کێشان بۆ سەرەوە و پساندن
هەڵپە (٤٥،٣٢): پەلە پەل کردن لە کارا، بێ ئارامی و لە سەر خۆ نەبوون لە کاتی ئەنجام دانی کارا. (دستپاچگی، شتابزدگی)
هەڵپەرتاوتن (٣٤): هەڵبڕین، قەڵەم کردن، پەڕاندن.
هەڵپێکان (٣٣): تێک خستن، لە یەک بەستن، لە یەک گرێ دان.
هەڵتووتان (١٠١): لە سەر پاشوو دانیشتنی سەگ و شتی وا
هەڵچۆقان (١٢٧):قرچە و برژەی دەروون لەبەر ئێش و ئازاری لەش یان دەروون
هەڵدان (٢٠٢، ١٢٢): گەشە کردن، زیاد کردنی لەشی گیان لەبەر. (رشد)
هەڵشێواندن (٤٨): بڕوانە «دڵی پیاو هەڵدەشێوێنێ»
هەڵ کردنی ئاو (١٧٨): گۆڕینی ڕێبازی ئاو و ئاژین کردنی بۆ شوێنێکی تایبەت
هەڵکران (١٣): بڕوانە «لێ هەڵکران»
هەڵکراندن (١٢٠): خوراندن، خورانن
هەڵکورمان (٧٢): خۆ گرمۆڵکە کردن لە کاتی دانیشتنا بە هۆی کزی و بێ دەماخیەوە.
هەڵگرتن (٤٥): بڕوانە «ڕووی زەوی هەڵگرت»
هەڵوەدایی (١٨): تەرە بوون، ئاوارە بوونی دەشت و کێو
هەموار (١٩٢): ڕێک و پێک
هەناسەچن (١٣١): هەناسەبڕ، پشووگر، خەفەکەر
هەناو (١٧١، ٧٧): دەروون
هەنیسک (١١٩): نزگەرەی بە گریانەوە، لە نەکاو پشوو دانی کەسێک کە بە هۆی زۆر گریانەوە پشووی سوار بووە.
هەنیە (٣٦): ناوچاو، ناوچاوان، تەوێڵ
هەوارگە (١٣١): شوێنی مانەوەی کاتی هاوین لە کوێستان،
هەودا (٨٨): تاڵ، تاڵی دەزوو و موو و شتی وا
هەوەجێ (٢٧٢): پێویستی، ئیحتیاج

**هیلال** (٢٨٤): **مانگی نوێ كه كز و لاواز و زەردە**
**هێما** (٤٥): **ئیشارە**
**هێور** (١١٧): **هێمن، هێدی، ئارام**

**ی**

**یاو** (٢٠٤، ١٩٤، ٦٤): **تاو و لەرز، گەرم داهاتنی لەش بە نەخۆشی.** (تب)
**یەكڕا** (٩٧): **هاو باوەڕ.** (همفكر، موافق)

## ئەو بەرهەمانەی نووسەر کە پێشتر چاپ کراون:

١ - «فریشتەی کۆلیل» (کۆمەڵە شێعری کوردی)، بڵاوکەرەوە: نووسەر، چاپی یەکەم: تاران ١٣٧٤.

٢ - «عروض نوین فارسی» (کتێبێکی دەرسی زانستگاییە لە سەر عەرووزی فارسی)، بڵاوکەرەوە: انتشارات «ققنوس»، چاپی یەکەم: تاران ١٣٨١.

٣ - «قلعەی زنگە و قلمرو بغداد یان شەنگەی شارویران_ بحثی در شاهنامەشناسی» (لێ کۆڵینەوەییێکە لە بارەی پاڵەوانێکی شاهنامەوە کە کورد بووە)، بڵاو کەرەوە: نووسەر، چاپی یەکەم: بۆکان ١٣٨٥.

٤ - «بەیانی کوردی»، بڵاوکەرەوە: نووسەر، چاپی یەکەم: بۆکان ,١٣٨٦

٥ - «بیان» (کتێبێکی دەرسی زانستگاییە لە سەر بەیانی فارسی)، بڵاوکەرەوە: انتشارات «کتاب زمان»، چاپی یەکەم تاران ,١٣٨٧

٦ - «وزن شعر کردی و تطبیق آن با وزن شعر فارسی» (کێشی شێعری کوردی و بەراوەردی لەگەڵ کێشی شێعری فارسی)، بڵاوکەرەوە: انتشارات «کتاب زمان»، چاپی یەکەم تاران ,١٣٨٧

٧ - «مەرگی سۆراب» (کۆمەڵە شێعری کوردی)، بڵاوکەرەوە: نووسەر، چاپی یەکەم: بۆکان ١٣٨٧.

## ئەو بەرهەمانەی نووسەر کە ئامادەی چاپن:

١ - «حماسەی تحقیق: زندگی، اندیشەها و مبارزات دکتر عبدالخالق پرهیزی به قلم خودش» (ژیاننامەی نووسەر کە خۆی بە زمانی فارسی نووسیویە.)

٢ - «سیر علوم بلاغی در ادب فارسی» (مێژووی بەلاغەتی فارسی: نامەی دوکتورای نووسەر بە زمانی فارسی)